

# حوکم کردن بەقورئان

## و ڕەددانەوەی شوبوهاتەکان

دەربارەی ( كُفْر دُونَ كُفْر )

قەولی ابن عباس تەرجومانی قورئان

نوسینی: عبدالله



KTIBXANAY TWESHW

# حوکم کردن بەقورئان و ڕەددانەوەی شوبوهاتەکان

# دەربارەی کُفْر دُونَ کُفْر

# قەولی ابن عباس تەرجومانی قورئان

نوسینی: عبدالله

وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّه: حَدَّثَنِي الْعَبَّاسُ بْنُ أَبِي رِزْمَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ **عَبْدَ اللَّهِ** يَقُولُ:بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْقَوَائِمُ، يَعْنِي الْإِسْنَادَ.

واتا: عبداللَّەی کوڕی موبارەك دەڵێ: لەنێوان ئێمەو لە نێوان خەڵکی پەیژەکانە، واتا: ئیسنادە.

(مقدمة مسلم)

## ئەم کتێبە ئەم ناوەڕۆکانە لە خۆ دەگرێت:

- باسکردن و کۆکردنەوەی ئەو ڕێگایانەی کە ئەو ئەثەرەی لێ هاتووەو ڕوونکردنەو دیاری کردن و جیاکردنەوەی لاوازی ئیسنادە صەحیحەکان لەگەڵ لاوازەکان.

- جیاوازی لەنێوان کوفرێك کە ئەلیف و لامی پێوەیەو لەگەڵ کوفرێك کە ئەلیف و لامی پێوە نییە.

- وتەی زانایان دەربارەی عیلەلی فەرموودەو وردی و دەقیققی ئەو زانستە.

- ئایە صەحابەی تر تەفسیری بۆ ئەم ئایەتە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ کردووە ؟

- ئەگەر ڕاجیایی لەنێوان صەحابە هەبوو دەربارەی تەفسیری ئایەتێك چی بکەین ؟

- خەواریجەکان مەبەستیان لەو ئایەتە ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ چی بووە ؟

- ڕەدانەوەی ئەو شوبهەی کە ابن بطة ئەو ئەثەرەی ابن مەسعود دەربارەی ڕیشوە لەژێر ئەو تاوانانە داناوە کە لەدیینی ئیسلامی دەرناکات ! ئایە ابن بطة مەعصومە و واز لەقورئان و فەرموودەو قسەی صەحابە دەهێنرێت بۆ وتەی ابن بطة ؟

- وەڵام دانەوەی ئەو شوبهەی کە هەموو ئەوانەی ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگە خەواریجن ! ئایە هەموو ئەوانەی ئیستدلال بەو ئایەتە دەکەن خەواریجن؟

- ئایە لەسەعیدی کوڕی جوبەیر جێگیر بووە کە گوتبێتی خەواریج ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگە ؟

- ئایە مەبەست لەو ئایەتە کێ دەگرێتەوە ؟ وە ڕەدانەوەی شوبهەکان ئەو سێ وشەیە الکافرون و الظالمون و الفاسقون ئایە مەبەست پێی چییە؟

- وەڵام دانەوەی ئەو شوبهەی کەوا دەڵێن ستەکردن لەحوکم کوفری بچووکەو ئیجماعی لەسەرەو یەك تەفسیر هەیە بۆ ئەو ئایتەو ڕاجیایی نییە !

- ئەو کوفر دونە کوفرە کێ دەیکاتە بەڵگە ؟

- حوکمی تەبدیل و گۆڕینی شەرعی اللّٰه تعالی یان ڕەتکردنەوەی چییە ؟

- تەركی تەواوی حوكمی اللَّه تعالی لەلای خەلەف بەڵگە لەسەر كافربوونی كەسێك بەهۆی إستحلال كردنی یەك كردەوە و بێ ئەوەشی بیداتە پاڵ الله و وەڵامدانەی چەند شوبهەیەك
- بەڵگە لەسەلەفەوە دەربارەی تەركی حوكم
- ئایا ئیمامی موعاویەی كوڕی أبو سوفیان تەشریعی كرد
- لەچ حاڵەتێك حوكم كردن بەغەیری قورئان كفر دون كفرە كوفری بچوكە؟
- حوكم نەكرد بە قورئان كوفری بچووكە بەچەند ضوابط و مەرجێك و ڕەدانەوەی ئەو حەسركردنەی كەوا بەس بەهۆی حەڵاڵكردنەوە پێی كافر دەبێت.
- چەندین بابەتی تری گرنگ.....................

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد ﷺ أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

هەموو ئەوانەی کە ئەم کتێبە دەخوێننەوە بزانن کەوا ئێمە حوکم نەکردن بەوەی الله دایبەزاندووە بەرەهایی و بەموتلەقی بەکوفری گەورە نازانین بە لْکو دەلێین ئەسڵ لەحوکمدا کوفری بچووکە بەمەرج دەبێتە کوفری گەورە، مەرجەکانیش بریتین لە:

یەکەم: تەبدیل کردن و گۆڕینی شەریعەت.

دووەم: پەکخستن و تەعتیلکردنی حوکم یان حەددێك، بەو مەرجانە دەبێتە کوفری گەورە، ئەگەر هاتوو حاکمێك هەموو حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ بکات تەنها یەك حوکم بگۆڕێ و تەبدیلی بکات ئەوا پێی کافر دەبێت بەبێ هیچ مەرجێك ئەگەر تەنها بۆیەك جاریش ئەو کارە بکات چونکە گۆڕینی شەریعەت بەرەهایی کوفری گەورەیە،

بەنموونە: ئەگەر حاكمێك حەددو سزای دزیكردن كە دەست بڕینە بگۆڕێ بۆ زیندانی كردن ئەگەر بۆیەك جاریش ئەوە بكات ئەوە پێی كافر دەبێت بە كۆدەنگی زانایان، بەهەمان شێوە حاكمێك ئەگەر حوكمێك بە موتڵەقی پەك بخات وكاری پێ نەكات ئەوا ئەویش كافرە، كوفرەكەی هەمان كوفری ئەهلی كیتابە كەوا تەركی حەددەكانیان كردبوو، ئەمەش تەسلیم نەبوونە بۆ فەرمانەكانی اللەو بەم كارەی پێی لەدین دەچێتە دەرەوە، وە بۆ ئەو قسانەمان بەڵگەمان وتەی الله پاشان پێغەمبەرەكەیەتی و وتەی زانایانی كۆن و ئێستایە كە لەداهاتودا دەیبینن بەئیزنی الله تعالی، هەركەسێك شەرعی الله بگۆڕێت بە حوكمێكی تر ئەگەرچی یەك حوكم و حەددیش بێت, یان ئەگەر یەك حوكم و حەدد بە موتڵەقی تەعطیل بكات و كاری پێ نەكات ئەوە كوفری گەورەیە بە نەص و ئیجماع بەبێ هیچ قەید و مەرجێك، عبدالله ـی كوڕی عبد الحميد الأثري دەڵێ: (التشريع المخالف لشرع الله، وتطبيقه، والإلزام به: فمن شرع حكماً غير حكم الله تعالى، وحكمه في عباده، أو بدل شرع الله تعالى، أو عطله، ولم يحكم به، واستبدل به حكماً طاغوتياً وحكم به؛ فهذا كفر أكبر، لأنه ناقض من نواقض الإيمان وردة عن الإسلام. ولا يشترط فيه الاستحلال؛ لأن فعله إباء وامتناع عن الالتزام بشرع الله تعالى). (الإيمان حقيقته خوارمه نواقضه عند أهل السنة والجماعة : ٩٤١) واتا: تەشریع و یاسادانانێك كە موخالەفەی شەرعی الله تعالی ـیە , یان حوكم كردن بە غەیری ئەوەی الله تعالی دایبەزاندووە, وە پابەند بێت پێیەوە, ئەوا بزانە

کەوا هەرکەسێك حوکمێکی پێچەوانەی حوکمی الله تعالی دابنێت و لەنێوان بەندەکانیدا حوکمی پێ بکات, یان شەرعی الله تعالی تەبدیل بکات و بیگۆڕێت, یان تەعطیلی بکات و پەکی بخات و حوکمی پێ نەکات , وە بیگۆڕێت بە حوکمێکی دانراوی طاغوتی و حوکمی پێ بکات, ئا ئەمە کوفری گەورەیە بە نەصی قورئان و سوننەت و ئیجماعی زانایان , چونکە ناقض و هەڵوەشێنەرەوەیەکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان, وە ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیە لە دینی ئیسلام, وە بەمەرجیش نەگیراوە ئیلا کارەکەی بەحەڵاڵ بزانێ چونکە ئەم کارەی بەڵگەیە لەسەر ڕازی بوونی بە غەیری بەرنامەی الله تعالی, وە بەڵگەیە لەسەر نەویستن و پشت هەڵکردنی لە پابەند بوون بە شەرعی الله تعالی. جا لێرەدا ڕوون بوویەوە کە ئاثاری (کفر دون کفر) هەرگیز حاکمێك ناگرێتەوە کە تەبدیلی شەرعی الله ـی کردووە یان تەعطیل کولی حوکمێکی کردووە, چونکە ئەم کارە کوفری گەورەیەو پەیوەندی بە هیچ قەید و مەرجێکیشەوە نییە، چونکە هەرکەسێك شەریعەتی الله تعالی لابەرێت و دووری بخاتەوە لە حوکم کردندا, وە قانون و یاسای دەستکردی دانا و خستیە شوێنی شەریعەتەوە, ئەوە ئەم کارە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسە پێی وایە ئەم قانون و یاسایە باشتر و چاکترە لە شەریعەت, وە ئەمەش هیچ گومانی تێدا نییە کەوا کوفری گەورەیەو مرۆڤ لە ئاین دەردەکات وە هەڵوەشێنەرەوەی تەوحیدە، لەکۆتایشدا ئێمە بانگتان دەکەین بۆ تەوحید

نەك بۆ ڕای فلاّن تاقم و دەستەو گروپ بەڵکو بانگتان دەکەین بۆ گێڕانەوە بۆ قورئان و فەرموودە بەتێگەیشتنی سەلەف نەك تێگەیشتنی کەسانێك کە بەئارەزووی خۆیان وتە دەدەنە پاڵ سەلەف، وبشزانن واللەی دڵسۆزین بۆتان و نامانەوێت توشی هیچ گیروگرفتێکی عەقیدەیی بن چونکە ئەو بابەتە بابەتێکی عەقیدەییە.

اللّٰه تعالی فەرمانی کردوە شوێن قورئان بکەوین و حوکم و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین هەروەکو دەفەرموێت: ﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ (الأعراف: ٣). واتا: شوێنی ئەو قورئانە بکەون کە بۆتان دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتانەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ واتا: وە ئێمە ئەو قورئانە پیرۆزەمان بۆ دانەبەزاندووی تەنها بۆ ئەوە نەبێت ئەو شتەی کە ناکۆکی و جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە لە بابەتی یەك اللّٰهپەرستی و زیندوو بوونەوە تا تۆ بۆیان ڕوون بکەیتەوە.

حوکم کردن بەقورئان و ملکەچ بوونی مەرجە بۆ دروستی تەوحید و قەبوڵ بوونی ئیسلامەتی، هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الجاثية:١٨). ئەی محمد ﷺ پاشان تۆمان خستۆتە سەر شەریعەت و بەرنامەیەکی ئاشکرا تۆ شوێنی بکەوەو کاری پێ بکە وە شوێن هەواو ئارەزووی ئەو کەسانە مەکەوە کە تەوحیدو یەك اللَّه پەرستی اللَّه تعالی نازانن.

هەروەها اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (إبراهيم:١). واتا: ئەی محمد ﷺ ئەم قورئانە پیرۆزە کتابێکە بۆ تۆمان دابەزاندووە تا بەو قورئانە پیرۆزە خەڵکی لە تاریکیەکانی کوفرو شیرك و نەزانی و گومڕایی دەربکە ی بۆ ڕووناکی ئیمان و ئیسلام و هیدایەت و زانیاری بە ئیزنی پەروەردگاریان بۆ ڕێگای اللَّەی زۆر بەدەسەڵاتی سوپاسکراوە.

چەندین ئایەتی تر هاتوون کە اللَّه تعالی فەرمان دەکات حوکم بەو قورئانە بکرێت و کاری پێ بکرێت لەم کتێبەدا بەفەزڵی اللَّه تعالی هەستاوین بەباس کردنی بابەتی حوکم کردن بەقورئان و ڕوونکردنەوەی ئەو ئەثەرەی کە دراوەتە پاڵ صەحابەی بەڕێز ابن عباس، جا ڕوون و ئاشکرایە کە حوکم کردن بەو قورئانە ڕەبتی و پەیوەندی هەیە بە کرۆکی عەقیدەوە.

اللَّه تعالى دەفەرموویّت: ﴿مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءً سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ (يوسف:٤٠). واتا: جا هەرچی ئێوە دەیپەرستن جگە لە اللَّه تعالى تەنها خۆتان و باو و باپیرانتان ناوتان لێناون (تەنها ناون و ناوەڕۆکیان نی یە)، هەرگیز اللَّه تعالى بەوە ڕازی نییە و، هیچ بەڵگەیەکیشی ڕەوانە نەکردووە لەسەر پەسەند کردنیان، بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە اللَّه تعالى شایستەی کەسی تر نی یە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەش ئایین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست و بەنرخ، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن و لێی بێ ئاگان.

اللَّه تعالى هیچ کەسێکی نەکردۆتە هاوبەش و شەریکی خۆی لە حوکمیدا اللَّه تعالى دەفەرموویّت: ﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ (الكهف: ٢٦). واتا: بێگومان ئەو اللَّه تعالى یە لە کار و فەرمانڕەوایەتیەکەیدا هیچ کەس ناکات بەهاوتا و هاوبەشی خۆی.

حوکمی اللَّه تعالی ئەو حوکمەیە کە هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێگری لێ بکات و کۆسپ بخاتە ڕێگایەوە اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ﴾ (الرعد: ٤١). واتا: اللَّه تعالی خۆی حوکم دەکات و کەس نییە لەپاش بڕیاری اللَّه تعالی هیچ حوکمێك بدات و حوکمی اللَّه تعالیەه ڵوەشێنێتەوە.

اللَّه تعالی ئاگاداری کردووینەوە لەوەی تەنازول لە شەریعەتی ئیسلام نەکەین اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾ (المائدة: ٤٩). واتا: ئاگادار بە حەقەکەت لێ نەشێوێنن و فێڵت لێ نەکەن لە هەندێك لەوەی کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە بەوەی دەستکاری بکەن و پێتی بگۆڕن.

اللَّه تعالی نکوڵی لەو کەسانە کردووە کە داوای حوکمێکی تر دەکەن جگە لە حوکمی اللَّه تعالی بکەن. اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا﴾ (الأنعام: ١١٤). واتا: ڕەوایە (بۆ منی پێغەمبەر، بۆ منی ئیماندار) جگە لە اللَّه تعالی کەسێکی تر بکەمە حەکەم و دادوەر، لەکاتێکدا ئەو زاتە کتێبی پیرۆزی خۆی کە (قورئانە) بۆ دابەزاندوون کە هەموو دروست و نادروستێکی تیادا جیاکردۆتەوە.

اللَّه تعالی بەوە وەسفی خۆی کردووە کەچاکترینی دادوەرە وەك دەفەرموویێت: ﴿أَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ (المائدة: ٥٠). وە کاتێك باسی حوکمی خۆی دەکات دەفەرموویێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (المائدة: ٥٠). واتا: کێ هەیە بەقەدەر اللَّه تعالی حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

اللَّه تعالی بێجگە لە حوکمی خۆی حوکمەکان و یاسای تری ناوبردووە بە حوکمی جاهیلییەت اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ (المائدة: ٥٠). واتا: ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لا پەسەندە؟!.

اللَّه تعالی فەرمانی کردووە بە گێڕانەوەی دادوەری بۆ لای کتێبەکەی کە قورئانە لەکاتی ڕوودانی کێشە و ناکۆکی اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ (الشورى: ١٠). واتا: لەهەر شتێکدا کێشە و ڕای جیاوازتان بوو، ئەوە سەرئەنجامی بڕیارەکەی بۆ اللَّه تعالی خۆی دەگەڕێتەوە.

اللَّه تعالی میزانێکی دەقیق و وردی داناوە لەنێوان ئیماندارو دووڕووان، جا ئیمانداری ڕاستگۆ بەڕاستی ملکەچە بۆ حوکمی اللَّه تعالی و ڕازیە پێی و دەڵێ: گوێبیست بووم و فەرمانبەرداربووم، هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (النور: ٥١). واتا: کاتێك کە باوەڕداران بانگ بکرێن بۆ لای اللَّه تعالی پاشان رسول اللَّه ﷺ بۆ ئەوەی بڕیار لە نێوانیاندا بدات، واتە: بۆ لای قورئان و سوننەت تەنها وتەیەك هەیان بێت ئەوەیە ئەڵێن: ئێمە فەرمان و فەرمایشتی اللَّه تعالی پاشان رسول اللَّه ﷺ بیست وە گوێڕایەڵین ئا ئەم کەسە باوەڕدارانە سەرفرازو سەرکەوتوون لە دونیاو قیامەتدا.

بەڵام کەسی دووڕوو، پشت لە حوکمی اللَّه تعالی دەکات خۆی بەگەورە دەزانێ و لوتبەرزە لەدەربارەی حوکمی اللَّه تعالی هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (النور:٤٨). واتا: کاتێك بانگ بکرێن بڵێن: ئەی مونافیقان وەرن بۆ لای اللَّه تعالی پاشان رسول اللَّه ﷺ تا حوکم و بڕیار لە نێوانتاندا بدەن کۆمەڵێك لەوان پشت لە حەق ئەکات ، یاخود لە حوکم هێنان بۆ لای اللَّه تعالی پاشان رسول اللَّه ﷺ.

## دارِشتنی تەشریع حەقێکی تایبەتە بە اللَّە تعالی هیچ کەس شەریکی نییە،

هەرکەسێك بەرهەڵستی حوکمی اللَّە تعالی بکات موشریکە، هەروەکو چۆن اللَّە تعالی دەفەرمووێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّين مَا لَمْ يَأْذَن بِه اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (الشورى:٢١). واتە: ئاخۆ ئەوانەی رِێگای خواناسی ناگرن، ئایە کەسانێك هەن بەرنامە رِێژیان بۆ بکەن کە لەئاییندا چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن کە بە هیچ شێوەیەك اللَّە تعالی مۆڵەتی نەدابن، ئەگەر بەڵێنی اللَّە تعالی نەبوایە بە دواخستنی سزا بۆ رِۆژی قیامەت ئەوا هەر زوو لە دونیادا بریار درابوو لە نێوان ئەوان و ئیماندارەکاندا، بێگومان بۆ ستەمکاران و هاوەڵ بریاردەران سزایەکی بە ئازار هەیە.

حوکم کردن بەقورئان پەیوەندی بەعەقیدەو بیروباوەرەوە هەیە، حوکم کردن بەقورئان پەیوەندی هەیە: بەعیبادەتکردن بەتەنها بۆ اللَّە تعالی وە هەروەها رەبتی هەیە بەتەوحیدی پەروەردگارێتی وەهەروەها رەبتی هەیە بەتەوحیدی ئولوهیەتەوە، وەهەروەها رەبتی هەیە بەتەوحیدی ئەسمائو سیفات، وەهەروەها ، رەبتی هەیە بەئیمان، وهەروەها رەبتی هەیە بە ئیسلام، وەهەروەها رِەبتی هەیە بە هەردوو شەهادەکە.

یەکەمیان: پەیوەندی هەیە بە بەعیبادەتکردن بەتەنها بۆ اللَّە تعالی، اللَّە تعالی لەسورەتی یوسف و دەربارەی بانگەشەکردنی بۆ اللَّە تعالی لە بەندینخانەدا دەفەرموویێت: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (يوسف: ٤٠) واتا:ئێوە چی دەپەرستن جگە لە اللَّە تعالی تەنها خۆتان و باو و باپیرانتان ناوتان لێناون، هەرگیز اللَّە تعالی بەوە ڕازی نییە و هیچ بەڵگەیەکیشی ڕەوانە نەکردووە لەسەر پەسەند کردنیان، بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە اللَّە تعالی شایستەی کەسی تر نییە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەش ئایین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست و بەنرخ، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن و لێی بێ ئاگان.

هەروەها اللَّە تعالی دەفەرموویێت: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٥٦). واتا: زۆر لەهیچ کەسێك مەکەن کە موسوڵمان بێت، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست لەیەکتری جیابۆتەوە وبۆ خەڵکب ڕوون بۆتەوە ئەوەی باوەڕی نەبێت بە طاغوت کوفری پێبکات و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە اللَّە تعالی جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن

دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کەبریتییە لە (لَاإِلَهَ إِلَّااللَّه) کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، اللَّه تعالى بیسەرو زانایە.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(التوبة:٣١). واتا: جوولەکەکان زانایان هەبوو، وە گاورەکان خواپەرستیان هەبوو، ئەوان زاناو خواپەرستەکانیان کردبوو بە پەروەردگارو لە غەیری اللَّه تعالى دەیانپەرستن وە عیسای کوڕی مەریەمیشیان ئەپەرست لە کاتێکدا کە فەرمانیان پێ نەکرابوو تەنها بەوە نەبێت کە بەتاك و تەنها یەك اللَّه تعالى بپەرستن کە اللَّه تعالى هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی اللَّه تعالى اللَّه تعالى زۆر لەوە پاك و بێگەردترە کە ئەوان ئەو کەسانە ئەکەن بە شەریك بۆ اللَّه تعالى شەریك دانانیان بۆ اللَّه تعالى ئەوەبوو کە حەڵاڵیان بۆ حەرام ئەکردن ئەمان شوێنیان ئەکەوتن، وە حەرامیان بۆ حەڵاڵ ئەکردن و ئەمان شوێنیان ئەکەوتن، ئەوە پەرستنیان بوو.

دووەم: پەیوەندی بەتەوحیدی پەروەردگارێتی: اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ (الأعراف:٥٤). واتا: بێگومان پەروەردگارتان اللَّه تعالى یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەویە لە ماوەی شەش ڕۆژدا، پاشان لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی وەستا، بەشەو ڕۆژ دادەپۆشێت؛ لەکاتێکدا بەشێنەیی عەودالە بەدوایدا، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان) بە فەرمانی اللَّه تعالى کەوتوونەتە گەڕو لە فەرمانی دەرناچن، ئاگادار بن و بزانن و تێفکرن کە: هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، (کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین)، موبارەک و پیرۆزو گەورەیە زاتی اللَّه تعالى پەروەردگاری جیهانیان.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (القصص:٦٨). واتا: هەر پەروەردگاری تۆیە هەر چیەکی بوێت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت خەڵکی ئەو دەسەڵاتە یان نیەو سەرپشك نەکراون، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ اللَّه تعالى یە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە نەفامان دەیکەنە شەریك و هاوەڵ .

سێیەم: پەیوەندی بە ئەسمائو صیفاتەوە: لەدیارترین ناوەکانی اللَّه تعالى کە لە قورئاندا هاتووە بریتییە لە: الحَكَم، الحَاكم، الحَكيم. اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلًا وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ﴾ (الأنعام ١١٤). واتا: ئایا ڕەوایە (بۆ منی پێغەمبەر، بۆ منی ئیماندار) جگە لە اللَّه تعالى کەسێکی تر بکەمە حەکەم و دادوەر، لەکاتێکدا ئەو زاتە کتێبی پیرۆزی خۆی کە (قورئانە) بۆ دابەزاندوون کە هەموو دروست و نادروستێکی تیادا جیاکردۆتەوە، ئەوانەش کە کتێبی (ئاسمانیمان) پێداون (لە گاورو جوو) چاک دەزانن بەڕاستی ئەو قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە بەڕاست و ڕەوا دابەزێنراوە، کەوابوو ئیتر تۆ هەرگیز مەچۆرە ڕیزی گومانداروو دوو دڵانەوە.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (المتحنة:١٠). واتا: ئائەوە حوکم و فەرمانی اللَّه تعالى یە، کە خۆی فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانتاندا، اللَّه عزوجل هەمیشە زانا و دانایە.

وەهەروەها لەقورئاندا صیفاتی اللَّه تعالى هاتووە بەوەی چاکترین دادوەرە: (الأعراف:٨٧) (یونس:١٠٩) (یوسف:٨٠) اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾(الأعراف:٨٧). واتا: هەر ئەو زاتە خۆی چاکترینی دادوەرانە.

وە هەروەها لەقورئاندا هاتووە کە اللَّه تعالی ﴿أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ﴾ (هود:٤٥) (التين:٨). اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابْنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنْتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ﴾(هود:٤٥). واتا: پاش هێور بوونەوەی زریانەکە نوح هاواری لە اللَّه تعالی کردو جا وتی: ئەی پەروەردگارم کوڕەکەم لە خێزانی من بوو، بێگومان پەیمانی تۆش ڕاستە و تۆیش زاناترین و دادپەروەرترینی فەرمانڕەوایانیت.

اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ (الأنعام:٥٧ ). واتا: حوکم و فەرمانڕەوایی (هەمووشت) هەر بەدەست اللَّه تعالی یە، ئەو زاتە ڕاستی و حەقیقەتەکان دەخاتە ڕوو، چاکترین جیاکەرەوەشە (لە نێوان حەق و بەتاڵدا).

چوارەم: پەیوەندی بەئیمانەوە: اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ (النساء:٥٩). واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری گوێڕایەڵی اللَّه تعالى پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی اللَّه تعالى، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای اللَّه تعالى و پێغەمبەرەکەی (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە اللَّه تعالى و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.

ناصر السعدی دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: (فَالرَّدُّ إِلَيْهِمَا شَرْطٌ فِي الْإِيمَانِ فَلِهَذَا قَالَ: إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَدَلَّ ذَلِكَ عَلَى أَنَّ مَنْ لَمْ يَرُدَّ إِلَيْهِمَا مَسَائِلُ النِّزَاعِ فَلَيْسَ بِمُؤْمِنٍ حَقِيقَةً، بَلْ مُؤْمِنٌ بِالطَّاغُوتِ) (تفسير السعدي (ج:٢/٣١٨)
واتا: گەڕاندنەوەی کێشە بۆیان (بۆ قورئان و سونەت) مەرجێکە لە ئیمان وە هەر لەبەر ئەمەشە اللَّه تعالى فەرمویەتی: کاتێك لە شتێکدا توشی نیزاع دەبن حوکم بگێڕنەوە بۆ اللَّه تعالى و رسولەکەی ﷺ ئەگەر ڕاست دەکەن ئیمانتان بە اللَّه تعالى و بە ڕۆژی دوایی هەیە.

ئەمەش دەلالەت لەوە دەکات ئەوەی کێشەکانی نەگەڕێنێتەوە بۆ قورئان و سوننەت ئەوەبە ڕاستی ئیماندار نییە، بەڵکو ئیماندارە بەطاغوت.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾(النساء:٦٠). واتا: ئایا نابینی ئەوانەی کە بە گومانی خۆیان دەڵێن؛ ئەی محمد ﷺ ئیمانمان هێناوە بەو قورئانەی کە بۆ تۆ دابەزیوە وە بەو ئەو کتێبە ئاسمانیانەی کە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ دابەزیوە، ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾ کەچی دەیانەوێت حوکم بەرن بۆلای طاغوت و زۆرداران و خوا نەناسان و ئەوانەی کە حوکم بەغەیری قورئانی پیرۆز ئەکەن، ﴿وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ﴾، لە کاتێك فەرمانیان پێکراوە کە کوفر بکەن بەهەموو زاڵم و تاغوتێك، و شەیتانیش دەیەوێ گومڕایان بکات و لە ڕێگای ڕاست دووریان بخاتەوە بە گومڕاکردنێکی زۆر دوور.

اللَّه تعالی دەفەرموویّت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ (النساء: ٦٥). واتا: نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

اللَّه تعالی دەفەرموویّت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (النور:٥١). واتا: بەڵام گوفتاری ئیماندارران کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای اللَّه تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دە ڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع، هەر ئا ئەوانەشن سەر فرازو سەرکەوتوو.

پێنجەم: پەیوەندی بەئیسلامەوە: ئیسلام بریتیە لە: (الاِسْتِسْلامُ لِلّه بالتَوْحِيد، والانْقِيادِ لَهُ بالطَاعَة، وَالبَرَاءَة من الشِّرْك وَأَهْلِه) واتا: تەسلیم بون بۆ اللَّه تعالی بەتەوحید و ملکەچ بون بۆی بەگوێڕایەڵی و خۆبەریکردن لە شیرک و موشریکان.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ (النِّسَاءِ: ١٢٥). واتا: کێ ئاینی چاکتر و جوانترە لە کەسێك کە ڕووی کردۆتە اللَّه تعالى خۆی تەسلیمی ئەو زاتە کردووە، لە هەمان کاتدا ئەو کەسە چاکە کار بێت و شوێنی ئایینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ (ال عمران: ١٩_٢٠). واتا: بە دڵنیایی تەنها دینێك کە اللَّه تعالى پێی ڕازی بێ و قبووڵی بکات ئیسلامە وە ئەوانەی کە ئەهلی کتاب بوون و کتابی ئاسمانیان بۆ هاتبوو لە جوولەکەو گاورەکان ئیختیلاف و جیاوازی نەکەوتە نێوانیان ئیلا لە پاش ئەوە نەبێ کە عیلم و زانیاریان بۆ هات لە کتێبە ئاسمانیەکانی خۆیاندا کاتێکیش کە ئیمانیان ڕسول اللَّه ﷺ نەهێنا هەر لە حەسوودیدا بوو، یاخود لەنێوان یەکتریدا حەسودیان بەیەکتر برد وە هەر کەسێکیش کوفر بکات بە ئایەتەکانی اللَّه تعالى و ئیمانی پێ نەهێنێ ئەوا بە ڕاستی حیساب و لێپرسینەوەی اللَّه تعالى خێرایە.

ئەی محمد ﷺ ئەگەر هاتوو بە قسەی پووچەڵ گفتوگۆو دەمەقاڵێیان لەگەڵ کردی لەسەر یەکخواپەرستی ئەوە پێیان بڵێ من ڕووی خۆم تەسلیمی اللَّە تعالی کردووە بە ئیخلاصەوە عیبادەت بۆ اللَّە تعالی ئەکەم بە تاك و تەنها من و ئەو موسڵمانانەی کە شوێن من ئەکەون وە بەو کەسانە بڵێ: کە ئەهلی کتابن لە جوولەکەو گاور، وە نەخوێندەوارەکان کە موشریکانی عەرەبن: ئایا ئێوەش موسڵمان ئەبن ئەگەر موسڵمان بوون ئەوە بە دڵنیاییی هیدایەتیان وەرگرتووەو هاتوونەتە سەر ڕێگای هیدایەت وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد وە حەقیان وەرنەگرت ئەوە تەنها تۆ ئەوەندەت لەسەرە کە دینەکەی اللَّە تعالی یان پێ بگەیەنی، وە گەڕانەوەو لێپرسینەوەیان بۆ لای اللَّە تعالی یە وە اللَّە تعالی زۆر بینەرە بە بەندەکانی خۆی و ئاگای لێیانە.

اللَّە تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ (لقمان: ٢٢). واتا: وە هەر کەسێك خۆی تەسلیمی اللَّە تعالی بکات و کارەکانی بە اللَّە تعالی بسپێرێ و ئیخلاص و دڵسۆزی و نیەتی بۆ اللَّە تعالی بێت وە چاکەکاریش بێت، واتە: کردەوەکانی لەسەر سوننەت بێت و ملکەچی شەریعەت بێت ئەوە بە دڵنیاییی دەستی گرتووە بە پەتی هەرە بەهێزەوە کە دینەکەی اللَّە تعالی یە کە پچڕانی بۆ نیە وە سەرەنجامی هەموو کارەکانیش تەنها بۆ لای اللە ئەگەڕێتەوە.

اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (ال عمران:٨٥). واتا: جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ (النحل:٨٩). واتا: وە ئێمە ئەو قورئانەمان بۆت دابەزاندووە بۆ ئەوەی هەموو شتێك بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە وە ئەم قورئانە هیدایەت و ڕەحمەت و موژدەیە بۆ موسڵمان.

شەشەم: پەیوەندی بەدوو شەهادەکەوە: شەهادەی أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه ئەوە باسمان کرد لە بەشی: عیبادەتکردن بەتەنها بۆ اللَّه تعالی (تَوْحِيدُ العبَادَة).
وە شەهادەی أنَّ مُحَمَّدًا رسُول اللَّه: اللَّه دەفەرمووێت: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾(النساء: ٦٥). واتا: نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن دوای ئەوەش نابێ لە دڵ و دەروونیاندا هیچ نارەزاییەک دروست بێ بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێ بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾(الحشر: ٧) واتا: وە ئەوەی کە رسول اللَّه تعالى بۆی هێناون ئێوە وەری بگرن، وە ئەوەیشی کە رسول اللَّه ﷺ نەهی لێکردووە دەستی لیَ هە ڵبگرن، واتە: گوێڕایەڵی رسول اللَّه ﷺ بکەن چونکە ئەو تەنها فەرمانتان پێ دەکات بە چاکەو رێگریتان لێدەکات لە خراپە.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ (آل عمران: ٣١ و٣٢) واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن اللَّەتان خۆش ئەوێ ئەوە شوێن من بکەون ئەوە ئەو کاتەش اللَّه تعالى ئێوەی خۆش ئەوێ وە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێت. ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی اللَّه تعالى پاشان رسول اللَّه ﷺ بکەن ئەگەر پشتیان هەڵکرد لە گوێڕایەڵی اللَّه تعالى پاشان رسول اللَّه ﷺ ئەوە اللَّه تعالى کافرانی خۆش ناوێ .

چەندین بەڵگەی ڕوون هاتووە کە گوێڕایەڵی کردنی غەیری اللَّه تعالى و پشت هەڵکردن لە حوکمی اللَّه تعالى شیرك و کوفرە.

اللَّه تعالى دەفەرموویت: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ (الكهف: ٢٦). واتا: بێگومان ئەو اللَّه تعالى لە کار و فەرمانڕەوایەتیەکەیدا هیچ کەس ناکات بەهاوتا و هاوبەشی خۆی.

ابن جرير الطبري دەربارەی ئەو ئایەتە: (وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا دەڵێ: ((يَقُول : وَلَا يَجْعَلُ اللَّهُ فِي قَضَائِهِ وَحُكْمِهِ فِي خَلْقِهِ أَحَدًا سِوَاهُ شَرِيكًا , بَلْ هُوَ الْمُنْفَرِدُ بِالْحُكْمِ وَالْقَضَاءِ فِيهِمْ , وَتَدْبِيرِهِمْ وَتَصْرِيفِهِمْ فِيمَا شَاءَ وَأَحَبَّ) واتا: اللَّه تعالى هیچ یەکێك لەخەڵکی بێجگە لەخۆی ناکاتە شەریك لەبڕیاردان و حوکمیدا، بەڵکو خۆی تاکە لە حوکم و بڕیاردان دەربارەیان، لە ڕێکخستنیان و بەڕیوە بردنیان.

اللَّه تعالى دەفەرموویت: ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام:١٢١). واتا: وە ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی ئەوان بکەن ئەوا ئێوەش لە موشریکان ئەبن، نابێ گوێڕایەڵی موشریك بکەن و ئەوان حەڵاڵ و حەرامتان بۆ دیاری بکەن.

اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (المائدة: ٥٠). واتا: ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لا پەسەندە؟! کێ هەیە بەقەدەر اللَّه تعالی حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ﴾ (الشورى: ٢١). واتا: ئاخۆ ئەو (بێ باوەڕ)انە هاوبەشانێکیان هەیە بەرنامە و ئاینێکیان بۆ داناون کە اللَّه تعالی ڕێگەی پێ نەداوە.

ابن کثیر دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: (أَيْ: هُمْ لَا يَتَّبِعُونَ مَا شَرَعَ اللَّهُ لَكَ مِنَ الدِّينِ الْقَوِيمِ، بَلْ يَتَّبِعُونَ مَا شَرَعَ لَهُمْ شَيَاطِينُهُمْ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ) واتا ئەوبێ باوەڕانە شەریکیان بۆ اللَّه تعالی داناوە کە شوێن یاساکەی ناکەون کەبۆیانی داڕشتوە بەڵکو شوێن ئەوە دەکەون کە شەیطانەکانیان بۆیانیان داناون لەشەیطانە مرۆڤەکان و جنەکان.

حوكم كردن بەغەيری ئەوەی اللَّە تعالی دايبەزاندووە شيركی گەورەيە، لەو شتانەی كە بۆ اللَّە ی تعالی جێگير دەكەين هەروەكو چۆن اللَّە تعالی بۆخۆی جێگيری كردووە كە بريتييە لەو شتانەی كە دەچێتە ناو ماناكانی ڕبوبيەت و ئولوهيەت، حوكميش عيبادەتێك پێويستە تێيدا تەوحيد هەبێت لەحوكم، پێويستە اللَّە تعالی بەتاك ڕابگيرێت لەحوكمدا بەو صيفتە بەرزە ی كە خۆی وەسفی خۆی پێكردووە، بەوەی حوكم نەبرێتەوە لای هيچ كەسێك جگە لە اللَّە تعالی وە تەرك كردنی حوكم بەوەی اللَّە تعالی دايبەزاندووە، شيركی تەعطيلی تێدايە بەوەی حوكمی اللَّە تعالی پەكخستووە، وە حوكمكردن بەغەيری ئەوەی اللَّە تعالی دايبەزاندووە شيركی تەمثيلی تێدايە بەوەی كەوا حوكمێكی هێناوە هاوشێوەی حوكمی اللَّە تعالی!

## كەسێك صيفەتێك لەصيفاتەكانی اللَّە تعالی پەك بخات حوكمی چييە؟

ابن تيمية دەڵێ: (وَالتَّعْطِيلُ شَرٌّ مِنْ الشِّرْكِ وَكُلُّ مُعَطِّلٍ فَلَا بُدَّ أَنْ يَكُونَ مُشْرِكًا) (مجموع الفتاوى (١٦/ ٥٦٧). واتا: پەك خستنی صيفاتەكانی اللَّە تعالی زۆر خراپترە لەشيرك، وە هەموو پەكخەرێك هەردەبێ موشريك بێ.
جچای ئەوەی صيفەتی ڕبوبيەت و صيفاتی حەكەم بێت !؟
كە اللَّە تعالی چاكترينی دادوەرانە.

ابن القيم دەربارەی تەوحید دەڵێ: (وَهُوَ أَنْ يَشْهَدَ انْفِرَادَ الرَّبِّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى بِالْخَلْقِ وَالْحُكْمِ) (مدارج السالكين (٤١٢/١). واتا: بریتییە لەوەی شایەتی بەتاك و تەنهای اللَّه تعالی بدات لەدروست كردن و حوكمیدا.

ابن القيم دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ﴾ (الحجرات: ٢) واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، دەنگتان بەسەر دەنگی رسول اللَّه ﷺ بەرز مەكەنەوە لەكاتی گفتو گۆدا، قسەبێ پەردەمەكەن لەخزمەتیدا، نەوەكو كردەوەكانتان پووچ بێتەوە و هەستیشی پێ نەكەن.

جا ابن القيم دەڵێ: (فَإِذَا كَانَ رَفْعُ أَصْوَاتِهِمْ فَوْقَ صَوْتِهِ سَبَبًا لِحُبُوطِ أَعْمَالِهِمْ فَكَيْفَ تَقْدِيمُ آرَائِهِمْ وَعُقُولِهِمْ وَأَذْوَاقِهِمْ وَسِيَاسَاتِهِمْ وَمَعَارِفِهِمْ عَلَى مَا جَاءَ بِهِ وَرَفْعُهَا عَلَيْهِ؟ أَلَيْسَ هَذَا أَوْلَى أَنْ يَكُونَ مُحْبِطًا لأَعْمَالِهِمْ). واتا: گەر بەرز كردنەوەی دەنگ بە سەر دەنگی رسول اللَّه ﷺ هۆكار بێت بۆ هەڵوەشانەوەی كردەوەكان؛ ئەی پێش خستنی دیدو تێروانین و ئەقڵ و سیاسەت و ئارەزو بەسەر ئەو شەرع و دینەی رسول اللَّه ﷺ پێی هاتووە، لە پێشتر نییە بە هەڵوەشانەوەی كردەوەكانیان؟

نوسینی: عبدالله
٢٠٢١/٦/٦

دەمەوێ سەرنجت بۆ بابەتێکی زۆر هەستیارو بەربڵاو ڕاکێشم ئەویش بابەتی حوکم کردن بەقورئان و ئەثەرەکەی صەحابەی بەڕێز ابن عباسە (ڕەزای اللەتعالی لێ بێت) ئایە ئەو تەفسیرە بۆ ئایەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ لە ابن عباس جێگیر بووە ؟ وە ئەگەر جێگیر بووە مەبەست پێی چییە؟!

وتراوە صەحابەی بەڕێز ابن عباس لە تەفسیری ئەو ئایەتە کە اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ وتویەتی: ئەوە ئەو مانایەی نیە کە بۆی دەچن بەڵکو ئەمە کوفرێکە لە بازنەی ئیسلام دەری ناکات و کوفری بچووکە.

## باسکردن و کۆکردنەوەی ئەو ڕێگایانەی کە ئەو ئەثەرەی لێ هاتووە:

ڕیوایەتی یەکەم: (حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ ، قَالَ : ثنا وَكِيعٌ ، عَنْ سُفْيَانَ ، عَنْ مَعْمَر، عَن ابْنِ طَاوُس ، عَنْ أَبِيه ، عَن ابْنِ عَبَّاس: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ: هِيَ بِهِ كُفْرٌ؛ وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ ، وَمَلائِكَتِه، وَكُتُبِهِ ، وَرُسُلِهِ) واتا: ئەوە کوفرە؛ بەڵام خۆ وەك ئەوە نیە کوفر بێت بە اللَّه تعالی و مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی.

جا ئەوە ئیسنادەکەی صەحیحەو دروستە وە لەڕووکەشدا وا دەردەکەوێت کە ئەو وتانە هەمووی وتەی ابن عباسە جا بەو هۆیەوە زۆربەی ئەوانەی ئیستدلال بەو ئەثەرە دەکەن و دەیکەنە بەڵگە بەو ئیسنادە صەحیحە هەڵخەڵەتاون!

وە ئەو تێکهەڵکێشان و إدراجەی کە لەڕیوایەتەکەی ئیمامی عبدالرزاق هاتووە لێیان خەفی بووەو لێی بێ ئاگان !!

## ڕیوایەتەکەی ئیمامی عبدالرزاق و غەیری ویش هاتووە دەڵێ:

ڕیوایەتی دووەم: (أخرج عبدالرزاق في تفسيره و أبو بكر بن الخلال في كتاب السنة، ومحمد بن نصر المروزي في تعظيم قدر الصلاة و ابن بطة في الإبانة و الطبري في تفسيره: قَالَ عَبْد الرَّزَّاق: أَخْبَرَنَا مَعْمَر , عَنْ اِبْن طَاوُس, عَنْ أَبِيه, قَالَ : سُئِلَ ابْن عَبَّاس عَنْ قَوْله: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُم بِمَا أَنْزَلَ اللَّه وَ فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ:هِيَ بِهِ كُفْر. قَالَ اِبْن طَاوُس: وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاَللَّهِ وَمَلَائِكَته وَكُتُبه وَرُسُله).

جا لەو ڕیوایەتە کە ئیسنادەکەی صەحیحە بەڕوونی هاتووە، ئەگەر سەرنج بدەی لەم سەنەدە إبن عباس بەس دەڵێت: هِيَ بِهِ كُفْر. واتا: ئەمە کوفرە.
وە ئەو ووتەیەی کە دەڵێت: وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاَللَّهِ وَمَلَائِكَته وَكُتُبه وَرُسُله
واتا: وەك ئەوە نیە کوفربێت بە اللَّه و مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی. وتەی ابن عباس نییە، بەڵکو هی ڕاویەکەیە اِبْن طَاوُس کە ئەتباعی تابعینــــە ئەمەش پێی دەوترێت مُدْرَج.
مُدْرَج چییە؟ مودرەج دەبێتە دوو بەش:
مودرەج لەئیسناد.
مودرەج لەمەتن.

جا ئەوەی ئێمە باسی دەکەین مودرەجەکە لە مەتنەکەی هەیە، پێناسەی مودرەج چییە ئەهلی حەدیث و فەرموودە ناسان بەو جۆرە پێناسەی مودرەج دەکەن دەڵێن: (هِيَ أَلْفَاظٌ تَقَعُ مِنْ بَعْضِ الرُواة مُتَّصِلَةً بِالْمَتْنِ، لَا يُبِينُ لِلسَّامعِ إِلَّا أَنَّهَا مِنْ صُلْبِ الْحَدِيث وَيَدُلُّ دَلِيلٌ عَلَى أَنهَا مِنْ لَفْظِ رَاوٍ، بِأَنْ يَأْتِيَ الْحَدِيثُ مِنْ بَعْضِ الطُّرُقِ بِعِبَارَةٍ تَفْصِلُ هَذا مِنْ هَذا) (الموقظة (ص:٥٣- ٥٤). واتا: بریتییە لەچەند لەفزێك كە لەڕاوی ڕوودەدات، ئەوەی فەرموودەكە دەگێڕێتەوە، کە لکاوە بەمەتنەکە (واتا: بەفەرموودەکەوە لکاوە) جا بۆ گوێگرەکەی ڕوون ناکاتەوە، ئیلا ئەوە نەبێت کە لەدوای فەرموودەکەوە دێت، جا بەڵگە لەسەر ئەوەی کەئەو مودرەجە وتەی ڕاوییە (واتا: لە فەرموودەکە نەهاتووە بەڵکو ئەوەی فەرموودەکە دەگێڕێتەوە زیادی کردووە) فەرموودە هەیە هاتووە لەهەندێك ڕێگەی ترەوە بە عیبارەتی تر ئەو مودرەج و زیادانە لێك جیا دەکاتەوە.

یان ئەوەتا بریتییە لە: (مَا غُيِّرَ سِياقُ إِسْنَادِهِ أَوْ أُدْخِلَ فِي مَتْنِهِ كلاماً لَيسَ مِنْهُ بِلا فَصْلٍ) (النزهة النظر لابن حجر(ص:٤٨). واتا: بریتییە لەوەی کە سیاقی ئیسنادەکەی گۆڕاوە، یان وتەیەك خراوەتە ناو مەتنەکەی کە تێیدا نییە بەبێ ڕوونکردنەوەو جیاکردنەوە لێی.

جا ئەو پێناسانە زۆر ڕوونە بۆ ئەو ئەثەرەی ابن عباس باشترین نمونەیە بۆی، جا ڕیوایەتی عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَعْمَر، سوفيان لە مەعمەرەوە لە ڕیوایەتی یەکەم گوێگر وا تێدەگات کە وتەکاناً هەمووی وتەی ابن عباسە، بەڵام ڕیوایەتی دووەم عَبْد الرَّزَّاق: أَخْبَرَنَا مَعْمَر، عبدالرزاق لە مەعمەرەوە، بەڵگە یەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە هەندێك لەوتەی تری پێوە لکاوەو بۆی زیاد کراوە ئەوەش پێی دەڵێن مودرەج، کە ئەو وتانەش، وتەی ابن طاوسە لەڕیوایەتەکەی تر دووەم گوتی: قَالَ اِبْن طَاوُس: وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاَللَّهِ وَمَلَائِكَته وَكُتُبه وَرُسُله. واتا: ابن طاوس گوتی: وەك ئەوە نییە کوفربێت بە اللّٰە و مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی.

جا بەو عیبارەتە هاتووە ئەوە لە ئەثەرکەی تر جیادەکاتەوە.

جا ئەگەر ئەو تەفسیرەی ابن طاوسیش وەرگرین مانای ئەوە نییە کەپێی کوفری بچووك بێت، بێگومان کوفری کەسێك کە حوکم بەقورئان و سوننەت ناکات وەکو کوفری ئەو کەسە نییە کە کوفر بە اللّٰە و مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی بکات !

ئاگات لەوەش بێت چونکە کوفر بەشێکی لەبەشێکی توندترە.

دێین بزانین ئەو ڕیوایەتەی کە مەعمەر  دەیگێڕێتەوە کە وا تێدەگەی ابن عباس گوتویەتی کە دەکاتە ڕیوایەتی یەکەم صەحیحترە یان ئەو ڕیوایەتە ی دووەم کە عبدالرزاق گێڕاویەتەوە کە بەڕوونی دیارە وتەی ابن طاوسەوە هی ابن عباس نییە .

جا چۆن بزانین کامەیان ڕاستە؟ ئێمە دێین هەردوو سەنەدەکە دێنین بزانین کامەیان لەوەی تر بەهێزتر بێت ئەم وەردەگیرێت.

دێین سەیردەکەین بزانین لە هەردوو سەنەد کێ پێچەوانەی ئەوی تری وتوە و کامەی صەحیحترە دێیین هەردوو سەنەدەکە دێنین لە ڕیوایەتی یەکەم: سەنەدەکە بەو شێوەیە: (مَعْمَر, عَنْ اِبْن طَاوُس, عَنْ أَبيه, عَنْ اِبْن عَبَّاس) لە ڕیوایەتی دووەم: سەنەدەکە بەو شێوەیە: (قَالَ عَبْد الرَّزَّاق: أَخْبَرَنَا مَعْمَر, عَنْ اِبْن طَاوُس, عَنْ أَبيه) کەواتا با بزانین ئەگەر هاتـو هاوەڵانی مَعْمَر مەعمەر ڕاجیاییان لێ پەیدابوو لە نەقڵکردنی ڕیوایەتی مَعْمَر قسەی کێ وەردەگیرێت؟ ئەگەر سەیری زانستی فەرموودە بکەین بە شارەزایانی زانستی فەرموودە بەتایبەت زانستی عیلەل هەر هەموویان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر هاتوو هاوەڵانی مَعْمَر ڕاجیاییان لێ پەیدابوو لەسەر گێڕانەوەی حەدیس لە مَعْمَر ئەوا قسەی عَبْدالرَّزَّاق بەسەر هەر هەموویانەوە دەخوات چونکە ئەو لە هەمویان شارەزاتر و باوەڕپێکراوترە لە فەرموودەی مَعْمَر.

زانایانی زانستی فەرموودەو عیلەل دەربارەی عَبْدالرَّزَّاق و مَعْمَر لە گێڕانەوەی فەرموودەدا دەڵێن:

(قال عباس الدوري عن ابن معين: كان عبد الرزاق أثبت في حديث معمر (تهذيب التهذيب ج٦/ص: ٢٧٩) واتا: ابن مەعین دەڵێ: فەرموودەی عَبْدالرَّزَّاق جێگیرترە لە مَعْمَر.

(قال يعقوب بن شيبة: عبد الرزاق أثبت في معمر، جيد الإتقان) (شرح علل الترمذي لابن رجب (٥٦١/٢). واتا: یەعقوبی کوڕی شەیبە دەڵێ: فەرموودەی عَبْدالرَّزَّاق زۆر جێگیر ترو دروسترە لەهی مَعْمَر، باشترو ئیتقانترە.
(قال محمد بن سهل بن عسكر: سمعتُ أحمد بن إسحاق يقول: إذا اختلف أصحاب معمر في حديث معمر فالحديث حديث عبدالرزاق) تاريخ أسماء الثقات/ج١/ص: ١٨٠٠) واتا: سهل بن عسكر دەڵێ: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی ئیسحاق بوو دەیگوت: ئەگەر هاوەڵانی مەعمەر ناکۆکیان هەبوو لە فەرموودەی مەعمەر ئەوە فەرموودە، فەرموودەی عبدالرزاقە واتا: وتەی ئەو دەخوات.
(قال ابن عبد البر: عبد الرزاق أثبت الناس في معمر) (التمهيد ج٦/ص: ٤١٠). واتا: ابن عبدالبر دەڵێ: فەرموودەی عبدالرزاق جێگیرترینی خەڵکیە لە فەرموودە ی معمر.

## هەروەها مەعمەر لەڕیوایەتی تریش ئیدراجی کردووە !!

(قال ابن حجر: وقع عند النسائي أيضا في حديث الزهري من رواية عبد الأعلى عن معمر زيادة البطة بين الكبش و الدجاجة لكن خالفه عبد الرزاق و هو أثبت منه في معمر فلم يذكرها) (فتح الباري ج٢/ص: ٣٦٨). واتا: ابن حەجەر لەپاش ئەوەی باسی فەرموودەیەك دەكات كە مەعمەر ئیدراجی كردووە زیادی كردووە جا ابن حەجەر دەڵێ: عبدالرزاق موخالفەی مەعمەری كردووەو ئەو زیادەی مەعمەر باسی كردووە عبدالرزاق باسی نەكردووە !

جا پێویستە لەسەر ئەوانەی ئیستدلال بەو ئەثەرە دەكەن زۆر ئاگاداربن چونكە زۆر ڕوون و ئاشكرایە لەلای فێرخوازی زانستی فەرموودە، كە صیحەت و دروستی هەواڵێك فەرموودەیەك ئەثەرێك، بەتەنها ڕاوەستاو نییە لەسەر عەدالەت و ضەبتی ڕاوییەكان، بەڵكو بەتەماشاكردنی هەموو ڕێگاكانی دەزانرێت، پاشان سەیركردنی عیلەل، بەنمونە ڕاجیایی هەیە لەسەر فەرموودەی مەقطوع و وصل و ڕەفع و وەقف.
جا الحمدللَّه كە شتەكە زۆر ڕوونە لەلای ئەوانەی كە بۆنی ئەو زانستە موبارەكەیان كردووە.

## جا زانایان دەربارەی عیللەتی فەرمووده (العلة) دەڵێن:

عليِّ بْن الْمَدِينِيِّ دەربارەی عیلەلی فەرمووده دەڵێ: (الْبَابُ إِذَا لَمْ تُجْمَعْ طُرُقُهُ لَمْ يَتَبَيَّنْ خَطَؤُه) (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع" (٢/ ٢١٢)، ط مكتبة المعارف، الرياض). واتا: ئەگەر ڕێگاکانی کۆنەکرێتەوە ئەوە هەڵەکەی ڕوون نابێتەوە.

عُثْمَانَ بْن سَعِيد الدَّارِمِيِّ دەڵێ: (سَمِعْتُ نُعَيْمَ بْنَ حَمَّادٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ الْمُبَارَكِ يَقُولُ: "إِذَا أَرَدْتَ أَنْ يَصِحَّ لَكَ الْحَدِيثُ فَاضْرِبْ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ) (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع" (٢/ ٢٩٥). واتا: عوثمانی کوڕی سەعیدی الدارمی دە لێ: گوێم لە نوعەیمی کوڕی حەماد بوو دەیگوت: گوێم لە ابن المبارك بوو دەیگوت: ئەگەر ویستت فەرموودەکەت صەحیح بێت ئەوە بەشێکی بەبەشێکی دادە. واتا: بەشێکی بەبەشێکی بپێوە.

الخطيب البغدادي دەڵێ: (وَالسَّبِيلُ إِلَى مَعْرِفَةِ عِلَّةِ الْحَدِيثِ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَ طُرُقِهِ، وَيَنْظُرَ فِي اخْتِلَافِ رُوَاتِهِ، وَيُعْتَبَرَ بِمَكَانِهِمْ مِنَ الْحِفْظِ وَمَنْزِلَتِهِمْ فِي الْإِتْقَانِ وَالضَّبْطِ) (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع" (٢/ ٢٩٥) واتا: ڕێگا بۆ زانینی عیللەتی فەرموده، دەبێ ڕیگانی تری کۆ بکرێتەوە، وە سەیری جیاوازی و ناکۆکی ڕاویەکانی بکرێت، ئەوەش بە شوێنییان لە حیفظ و ئیتقان و ضەبت دادەنرێت. واتا: بزانرێت کامەی حیفظ زبت و ئیتقانی بەهێزترە.

الحاكم النيسابوري دەڵێ: (وَعِلَّةُ الْحَدِيث، يَكْثُرُ فِي أَحَادِيثِ الثِّقَاتِ أَنْ يُحَدِّثُوا بِحَدِيثٍ لَهُ عِلَّةٌ، فَيَخْفَى عَلَيْهِمْ عِلْمُهُ، فَيَصِيرُ الْحَدِيثُ مَعْلُولًا) (معرفة علوم الحديث" (ص: ١١٢). واتا: عیللەتی فەرموودە (عیللەت واتا: عەیب، نەخۆشی) زۆر لەو فەرموودانەی کە ڕاوی ثیقە باوەڕ پێکراو دەیگێڕنەوە عیللەتی هەیە، جا ئەو عیللەتە لێیان شاراوەیەو هەستی پێناکەن، جا بەهۆی ئەو عیللەتەوە فەرموودەکە دەبێتە مەعلول.

ابن رجب دەڵێ: (وَأَمَّا الْفُقَهَاءُ الْمُتَأَخِّرُونَ، فَكَثِيرٌ مِنْهُمْ نَظَرَ إِلَى ثِقَةِ رِجَالِه، فَظَنَّ صِحَّتَهُ، وَهَؤُلَاءِ يَظُنُّونَ أَنَّ كُلَّ حَدِيثٍ رُوَاةٌ ثِقَةٌ فَهُوَ صَحِيحٌ، وَلَا يَتَفَطَّنُونَ لِدَقَائِقِ عِلْمِ عِلَلَ الْحَدِيثِ) (فتح البارى لابن رجب الحنبلى (١/ ٢٦٣). واتا: بەڵام فوقەهای متأخرین زۆربەیان سەیری جێی باوەڕی و سیقەی پیاوانی ئیسنادیان کردووەو گومانی صەحیحی و دروستی ئیسنادەکەیان کردووە، وە ئەوانە واگومان دەبەن هەموو فەرموودەیەك ئەگەر ڕاوی سیقە گێرایەوە ئیتر ئەوە صەحیحە، ئاگاداری وردی زانستی عیلەل نین.

ابن الصلاح دەڵێ: (فَالْحَدِيثُ الْمُعَلَّلُ هُوَ الْحَدِيثُ الَّذِي اطُّلِعَ فِيهِ عَلَى عِلَّةٍ تَقْدَحُ فِي صِحَّتِهِ، مَعَ أَنَّ ظَاهِرَهُ السَّلَامَةُ مِنْهَا) (علوم الحديث" (٨٩). واتا: فەرموودەی مەعلول بریتییە لە فەرموودەی کەوا سەیری ڕێگاکانی کراوە عیللەتێکی تێدایە کە صحەت و دروستی فەرموودەکە دەپچڕێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕووکەشی فەرموودەکە سەلامەتە !!

گوتم: لەبەر کۆنەکردنەوەی ڕێگاکانی تر و سەنەد و مەتنەکانی تر و سە یرنەکردنی ڕاوی ئەثەرەکەو بێ ئاگا بوون لەوەی کە کامەی بەهێزترە لە حیفظو ئیتقان و زەبتەوە کەوتونە ناو ئەو هەڵەیە !

جا بۆت ڕوون بۆوە کە وتەی ڕاست و دروست ئەوەیە کە ابن عباس دەربارە ی ئەو ئایەتە فەرموویەتی: هِيَ بِهِ كُفْر واتا: ئەمە کوفرە ، وە تەواوی لەفزو وتەکانی تر وتەی ابن طاوسە، هەروەکو چۆن ئەوە جێگیر بووە بە شوێنکەوتنی ڕێگاکانی گەورە موحەدیثانی ئەو ئوممەتە، وە ئەوەش لەهیچ کەسێك شاراوە نییە کە کەمترین شاهرزایی هەبێت لە زانستی فەرموودە.

جا ئەوەی زۆر سەیرو عەجیبە ئەوەیە ئەم کۆمەڵە گومڕایە شوێن ئەو ڕیوایەتە دەکەون کە موافقی خۆیانەو واز لەوە دێنن کە صەحیحترەو بە ڕوونی جێگیر بووە، لەکاتێك ئەوەی خۆیان وەری دەگرن مەعلولەو جێگیر نەبووە !!

پاشان سەرنجت بۆ گرینگی ئیسناد ڕادەکێشم کەچەندە گرینگەو ئەو دینە بەسەنەد گەیشتووە پێمان ئایە نابێت زۆر وریابین لەوەی فەرموودە لەکێ وەردەگیرێ و هی کێش ڕەتدەکرێتەوە ؟ بەتایبەت لەو بابەتە هەستیارانە جا ئەهلی عیلم دەربارەی گرینگی ئیسناد دەڵێن:

ئیمامی مسلم لە صحیحە کەی پێش دەست پێکردن نزیکەی سەد فەرمودەو ئەثەرو وتەی زانایـانی لەبارەی ئیسنادهێناوە یەکێک لەبابەکان بەناوی: بَابٌ: (بَيَانُ أَنَّ الْإِسْنَادَ مِنَ الدِّينِ، وَأَنَّ الرِّوَايَةَ لَا تَكُونُ إِلَّا عَنِ الثِّقَاتِ، وَأَنَّ جَرْحَ الرُّوَاةِ بِمَا هُوَ فِيهِمْ جَائِزٌ بَلْ وَاجِبٌ) واتا: سەنەد بریتی یە لەدین سەندی حەدیث واتە ناسینی کەسەکانی نێو فەرموودەکان وەدەڵێ ڕیوایەتی نابێ و ناکرێ تەنیـا لە کەسانی متمانە پێکراو نەبێ وەدیاری کردنی کەسانی مەجروح واتە کەسێ مُتهم بێ بەدرۆ یان حفظ ی لاواز بێ یان هەرشتێک ببێتە هۆی لەدەستدانی متمانەی دەڵێ واجبە لەسەر موسوڵمان و ئەهلی علم کارەبکات بۆئەوەی ئەو ڕاویانە بناسێت.

١. ابن المبارك دەڵێ: (الإِسْنَادُ مِنَ الدِّينِ وَلَوْلاَ الإِسْنَادُ لَقَالَ مَنْ شَاءَ مَا شَاءَ) (أخرجه مسلم في "مقدمة صحيحه" (١/ ١٥). واتا: ئیسناد لەدینەوەیە، وە ئەگەر ئیسناد نەبوایە ئەوە هەرکێ ویستبای شتێك بڵێ ئەوە دەیگوت.

٢. ابْنِ سِيرِينَ  دەڵێ: ((لَمْ يَكُونُوا يَسْأَلُونَ عَنِ الْإِسْنَاد، فَلَمَّا وَقَعَتِ الْفِتْنَةُ، قَالُوا: سَمُّوا لَنَا رِجَالَكُمْ، فَيُنْظَرُ إِلى أَهْلِ السُّنَّة فَيُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ، وَيُنْظَرُ إِلى أَهْلِ الْبِدَعِ فَلَا يُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ) (صحيح مسلم المقدمة باب في أن الإسناد من الدين حديث رقم: ٢٥). واتا: محمد بن سيرين دەفەرمووێت: پرسیاری سەنەد نەدەکرا لەسەرەتا بەڵام کاتێ فتنە سەری هەڵدا گوتمان ناوی پیاوەکانتان بێنن و بڵێن ، سەیری ئەهلی سنەدمان ئەکرد لێیان وەردەگرتن ،سەیری ئەهلی بدعەمان ئەکرد لێیان وەر نەدەگرت.

٣. ئیمامی الشَّافِعِيِّ دەڵێ: (الَّذِي يَطْلُبُ الحَدِيْثَ بِلا سَنَدٍ كَحَاطِبِ لَيْلٍ، يَحْمِلُ الحَطَبَ وفِيْه أَفْعَى لا يَدْرِي). واتا: ئەو کەسەی داوای فەرموودە دەکات بەبێ سەنەد، وەکو کەسێکە کە دار کۆدەکاتەوە لەشەوداو دار هەڵدەگرێت مارێکی تێدایەو پێی نازانێ.

٤. يحيى بن سعيد القطان دەڵێ: (لاَ تَنْظُرُوا إِلَى الحَدِيْث، وَلَكِن انْظُرُوا إِلَى الإِسْنَادِ، فَإِنْ صَحَّ الإِسْنَادُ، وَإِلاَّ فَلاَ تَغْتَرُّوا بالحَدِيْث إِذَا لَمْ يَصِحَّ الإِسْنَادُ) (أخرجه الخطيب في "الجامع لأخلاق الراوي" (٢/ ١٠٢)). واتا: سەیری فەرموودە مەکەن، بە ڵکو سەیری ئیسنادەکەی بکەن، جا ئەگەر ئیسنادەکەی صەحیح بوو باشە، ئەگەر وا نەبوو ئەوە هەڵمەخەڵەتێن بەفەرموودەیەك ئەگەر ئیسنادەکەی صەحیح نەبوو.

٥. وقال سفيان الثوري دەڵێ: (اَلإِسْنَادُ سِلاَحُ الْمُؤْمِنِ، فَإِذَا لَمْ يَكُنْ مَعَهُ سِلاَحٌ فَبأَيِّ شَيْءٍ يُقَاتِلُ ؟) (أخرجه الخطيب في "شرف أصحاب الحديث" (ص: ٤٢). واتا: ئیسناد چەكی ئیماندارە، جا كەسێك چەكی لەلا نەبێ بەچ شتێك دەجەنگێ ؟.

٦. پێشەوا ابن تيمية دەڵێ: (يَنْبَغِي لِمَنِ احْتَجَّ بِالْمَنْقُولِ أَنْ يُثْبِتَهُ). (منهاج السنة" (١٥٩/٦). واتا: پێویستە بۆ كەسێك كە وتەیەك دەكاتە بەڵگە، ئەو وتەیە جێگیر بووبێ.

## ئێستا دێین باسی ڕیوایەت و ڕیگانی تر دەکەین:

ڕیوایەتی سێیەم: (قال ابن نصر: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، ثنا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُم بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ: كُفْرٌ لَا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ) (تعظيم قدر الصلاة (٥٧٣)
واتا: ابن عباس گوتویەتی: ئەمە کوفرێکە لە بازنەی ئیسلام دەری ناکات.

سەنەدەکەی زەعیفە لەبەر ئەوەی ڕاویەك دیار نییە مەجهولە!!

ئەگەر سەیری سەنەدەکەی بکەین دەبینن کەسێکـــی تێدایە مەجهولە واتا کەس نایناسێت و ناوی نەهاتوە لە نێوان سُفْيَانَ و طَاوُس کەسێك هەیە ئەویش ناوی نەهاتوە بەڵکو بەس نوسراوە عَنْ رَجُلٍ واتا لە پیاوێکەوە !! ئەم پیاوە کێیە؟ کەس نازانێت ئایە ڕاستگۆیە یان درۆزنـــە یان زەعیفە.
جا کەسێك لە بەصەحیحی دانێت ئەو م پێچەوانەی قەواعیدی موحەدیثانی کردووە چونکە مەجهول لێی وەرناگیرێت.

ڕیوایەتی چوارەم: (حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ يَحْيَى قَالَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ، أَخْبَرَنَا الثَّوْرِيُّ ، عَنْ رَجُلٍ ، عَنْ طَاوُسٍ: ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾، قَالَ: كُفْرٌ لَا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ) (تفسير الطبري ((١٢٠٥٦).

بەهەمان شێوە ئەوەسش سەنەدەکەی لاوازە لەبەر ئەوەی ڕاویەك دیار نییە مەجهولە!! کەسێك هەیە ئەویش ناوی نەهاتوە بەڵکو بەس نوسراوە عَنْ رَجُلٍ واتا لە پیاوێکەوە !! ئەم پیاوە کێیە؟ کەس نازانێت ئایە ڕاستگۆیە یان درۆزنــــە یان زەعیفە. جا کەسێك لە بەصەحیحی دانێت ئەو م پێچەوانەی قەواعیدی موحەدیثانی کردووە چونکە مەجهول لێی وەرناگیرێت.

جا گوتم: ئەوەی سەیرە وتەکەی کردە وتەی طاوس نەك ابن عباس!! هەروەکو چۆن دەیبینی دەڵێ: عَنْ رَجُلٍ، عَنْ طَاوُسٍ!!! جا ئێمە دێین ئەو ڕیوایەتەیان بۆ ڕاست دەکەینەوە کە بەسەنەدێکی صەحیح هاتووە هەرچەندە لاوازیەکیش هەیە بەهۆی: سَعِيدٍ الْمَكِّيِّ بەشێك لەئەهلی حەدیث بە لاوازیان داناوە بەشێکیان دەڵێن مورجیئە بووە، بەشێکیش بە سیقەیان داناوە، ڕیوایەتەکە بەو شێوەیە: (حَدَّثَنَا هَنَّادٌ قَالَ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَحَدَّثَنَا ابْنُ وَكِيعٍ قَالَ ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَكِّيِّ، عَنْ طَاوُسٍ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ: لَيْسَ بِكُفْرٍ يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ) (تفسير الطبري (١٢٠٥٦). واتا: طاوس گوتی: کوفرێك نییە لەئیسلام دەری بکات.

گوتم: جا ئەوە بەڵگەیەكی زۆر ڕوونە وەكو ڕۆژی ڕووناك ئەگەر بە صەحیحی وەریگرین كە وتەكە وتەی طاوسە نەك هی ابن عباس بێت!!! هیچ كەسێك نكوڵی لەوە ناكات مەگەر كەسێك اللّٰه بەصیرەتی نەهێشتبێ و تەعەصوبی هەبێت بۆ ڕەئی و مەنهەجی خۆی !! نسأل اللّٰه السلامة.

ڕیوایەتی پێنجەم: (قال الحافظ ابن نصر: حدثنا يحي ابن يحي ثنا سفيان بن عيينة عن هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ عن طاوس عن ابن عباس في قوله تعالى: ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قال: لَيسَ الْكُفْرُ الْذِي يَذْهَبُونَ إِلَيْهِ). (تعظيم قدر الصلاة(٥٦٩)).

واتا: ابن عباس دەڵێ: ئەو كوفرە نییە كە بۆی دەچن.

سەنەدەكەی زۆر لاوازە ئەگەر سەیری سەنەدەكە بكەن كەسێكی تێدایە بەناوی هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ كەسێكی زۆر زەعیفە و حەدیثی لێوەرناگیرێت مەگەر گەر بێتو قەولێك نەقڵ بكات لە شوێنێكی تریش كەسێكی باوەڕپێكراو هەمان قسە بكات ئینجا لێی وەردەگرێت هەروەك چۆن ئەو حاڵەتە بەرچاوە لە صەحیحی بوخاری و مسلم ئەگەرنا قسەكەی ڕەتكراوە یە. وەهەروەها ئەو ڕیوایەتەی هیشام لەگەڵ ئەوەی كە لاوازەو زەعیفە پێچەوانەی ڕیوایەتی تریشی كردووە ئەمەش لەزانستی فەرموودە ناسی پێی دەگوترێت شاذ شاذیش پلەیەكە لەپلەكانی حەدیث و بەكەڵكی وەرگرتن نایێ لەخوار پلەی زەعیف دایە. بۆیە ئەو ڕیوایەتەی هیشام پێچەوانەی چەند ڕیوایەتێكی صەریح و صەحیحی كردووە لەدواییدا باسی دەكەین ئەو ڕیوایەتانەی كە لە ابن عباس جێگیر بووە .

وتەی الجرح والتعدیل زانایانی سەلەف لەسەر هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ:

(قال العقيلي في الضعفاء الكبير: حدثنا عبد الله بن أحمد قال: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: هِشَامُ بْنُ حُجَيْرٍ مَكيٌّ ضَعِيفُ الْحَدِيث) (العلل ومعرفة الرجال (٣/ ٣٠. واتا: ئیمامی عوقەیلی لە کتێبی الضعفاء الكبير دەڵێ: عبداللەی کوڕی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆی گێڕاینەوە، گوتی: گوێم لە باوکم بوو دە یگوت: هِشَامُ بْنُ حُجَيْرٍ زەعیفە.

(عبد الله بن أحمد سألت يحيى بن معين عن هشام بن حجير؟ فضعفه جدا) (العلل ومعرفة الرجال (٣/ ٣٠. واتا: عبداللَّەی کوڕی ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: پرسیارم کرد یەحیای کوڕی مەعین دەربارەی هشام بن حجير بەلاوازی دانا زۆر .

(قال علي ابن المديني: قرأت على يحيى بن سعيد : حدثنا ابن جريج عن هشام بن حجير، فقال يحيى بن سعيد : خَلِيقٌ أَنْ أَدَعَهُ , قُلْتُ لِيَحْيَى: أَضْرِبُ عَلَى حَدِيثِهِ ؟ قال : نعم) ((الجرح والتعديل لابن أبى الحاتم (٩/ ٥٤)). واتا: عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ: بۆ علی یەحیای کوڕی سەعیدم خوێندەوە: ابن جريج بۆی گێڕاینەوە لە هیشامی کوڕی حوجەیرەوە، یەحیا گوتی: سورم لەسەر ئەوەی وازی لێبێنم، پێم گوت: فەرموودەی لێ وەرنەگرم ؟ گوتی: بەڵێ.

(قال سعيد بن يحيى القطان عنه: ضعيف الحديث وضرب على احاديثه). (الضعفاء" للعقيلي (٣٣٧/٤). واتا: سەعیدی کوڕی یەحیای قەطان دەربارەی هیشامی کوڕی حوجەیر دەڵێ: فەرموودەکانی لاوازە، فەرموودەکان ڕەتکردەوە.

ڕیوایەتی شەشەم: (أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ سُلَيْمَانَ الْمَوْصِلِيُّ، ثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَرْبٍ، ثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ،عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: إِنَّهُ " لَيْسَ بِالْكُفْرِ الَّذِي يَذْهَبُونَ إِلَيْهِ، إِنَّهُ لَيْسَ كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ، ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ). (أخرج ابن أبي حاتم في التفسير ج٤ /ص١١٤٣ و المروزي في تعظيم قدر الصلاة ج٢ /ص٥٢١ و الحاكم في المستدرك ج٢/ص٣٤٢ و البيهقي في السنن الكبرى ج٨/ص٢٠ و ابن عبد البر في التمهيد ج٤/ص٢٣٧و أبي بكر بن الخلال في السنة١٤٢٥ )). واتا: ابن عباس دەڵێ: ئەو کوفرە نییە کە بۆی دەچن، کوفرێکی دەرخەر نییە لە ئیسلام، کوفرێکە لەخوار کوفرە.

ئەوەش زەعیفە بەهەمان شێوە هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ لەسەنەدەکەی هەیە کەسێکی زۆر زەعیفە و حەدیثی لێوەرناگیرێت هەروەکو لەپێشدا باسمان کرد.

ڕیوایەتی حەوتەم: (قال ابن نصر: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، ثنا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ رَجُلٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ: كُفْرٌ لَا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ) (تعظيم قدر الصلاة رقم: ٥٧٣)).

واتا: ابن عباس گوتویەتی: کوفرێکی دەرخەر نییە لەئیسلام.

ئەوەش سەنەدەکەی لاوازە ڕاویەك مەجهولە ئەگەر سەیری سەنەدەکەی بکەین دەبینین کەسێکی تێدایە مەجهولە واتا کەس نایناسێت و ناوی نەهاتوە لە نێوان سُفْيَانَ و طَاوُس کەسێك هەیە ئەویش ناوی نەهاتوە بەڵکو بەس نوسراوە عَنْ رَجُلٍ واتا لە پیاوێکــەوە! ئەم پیاوە کێیە ؟ کەس نازانێت ڕاستگۆیە یان درۆزنــە یان زەعیفە واتا مەجهولە کەسی وەك زانراوە بەمەرج نەبێت هیچی لێوەرناگیرێت.

ڕیوایەتی هەشتەم: (حَدَّثَنِي الْمُثَنَّى , قَالَ : ثنا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَالِحٍ , قَالَ : ثني مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ , عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ , قَوْلَهُ : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ: مَنْ جَحَدَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَقَدْ كَفَرَ , وَمَنْ أَقَرَّ بِهِ وَلَمْ يَحْكُمْ فَهُوَ ظَالِمٌ فَاسِقٌ) (أخرج الطبري في جامع البيان ١٦٦/٦ وابن أبي حاتم في التفسير ١١٤٢/٤) واتا: ابن عباس گوتویەتی: هەر کەسێك نکوڵی ئەوە بکات کە الله دایبەزاندوە کوفری کردوە بەڵام ئەوەی دانی پێدابنێت و بڵێت ڕاستە بەڵام حوکمی پێنەکات زاڵم و فاسقە.

سەنەدەکــەی زەعیفەو لاوازە دوو کەسی تێدایە بە ناوی (عَبْدُاللَّهِ بْنِ صَالِحٍ) و (عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ) هەردووکیان لاوازن !!

## وتەی شارەزایانی زانستی الجرح و التعدیل لەسەریان.

یەکەم: عَبْد اللَّه بْن صَالِح لاوازە

(قال عبد الله بن أحمد سألت أبي عن عبد الله بن صالح كاتب الليث بن سعد؟ فقال: كان أول أمره متماسك ثم فسد بآخره، وليس هو بشيء). (العلل ومعرفة الرجال (٢١٣/٣)). (الجرح والتعديل " ٥ / ٨٧، و" تاريخ بغداد " ٩ / ٤٨٠، و" الكامل " لابن عدي ٣ / لوحة ٤٣٨، و" تهذيب الكمال " لوحة ٦٩٤). واتا: عبداللەی کوڕی ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: پرسیارم لەباوکم کرد دەربارەی عَبْداللَّه بْن صَالِح کاتبی لەیثی کوڕی سەعد؟ گوتی: سەرەتاکەی پتەو بوو، پاشان لەکۆتاییدا خراپ بوو، وە هیچ نییە.

(قال ابن المديني وَلاَ أَرْوِي عَنْهُ شَيْئاً). (سير أعلام النبلاء ط الرسالة (٤١٤/١٠). (تاريخ بغداد " ٩ / ٤٨١، و" تهذيب الكمال " لوحة ٦٩٤). واتا: عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ: هیچ شتێکی لێ ناگێڕمەوە.

(قال النسائي ليس بثقة). (ميزان الاعتدال (٤٤١/٢) واتا: باوەڕ پێکراو نییە.

(قال أحمد بن صالح: متهم ليس بشيء). (ميزان الاعتدال (٤٤١/٢) واتا: تاوانبارکراوەو متهمە هیچ نییە.

(قال صالح جزرة كان ابن معين يوثقه، وهو عندي يكذب في الحديث). (ميزان الاعتدال (٤٤١/٢) واتا: ابن مەعین بەباوەڕ پێکراوی دادەنا، وە عَبْداللَّه بْن صَالِح لەلای منەوە درۆی هەڵبەستووە.

(قال ابن يونس لم يكن أحمد بن شعيب يرضاه). واتا: أحمەد کوڕی شوعەیب لێی ڕازی نەبوون.

(ابن حبان: ذكره في كتابه المجروحين ، وقال : منكر الحديث جدًّا). واتا: ابن حبان لەکتێبی مەجروحین باسی کردووە، وتویەتی: فەرموودەکانی زۆر مونکەڕە.

(ابن يونس: روى عن الليث مناكير). واتا: لە لەیثەوە مونکەڕی زۆری گێڕاوەتەوە.

(ابن الطبري: قال رشدين عنه : متهم ليس بشيء وقال فيه قولا شديدا). واتا: ابن طەبەڕی دەڵێ: ڕشدین دەربارەی عَبْداللَّه بْن صَالِح گوتویەتی: تۆمەتبارەو فەرموودەکانی هیچ نییە، وتەیەکی زۆر توندی دەربارەی گوت.

دووەم: عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة لاوازە

کەسێکی لاوازە و هیچ شتێکی لە ابن عباس گوێ لێ نەبووە !!

(قال ابن أبي حاتم سمعت أبي يقول: علي بن أبي طلحة عن ابن عباس مرسل إنما يروي عن مجاهد والقاسم بن محمد وراشد بن محمد ومحمد بن يزيد)). واتا: ابن أبى حاتم دەڵێ: گوێم لەباوکم بوو دەیگوت: عَلِي بْن أَبِي طَلْحَة لە ابن عباسەوە مورسەلە واتا: باسی ئەو کەسەی نەکردووە کە لەنێوان خۆی و ابن عباس هەیەو پچڕانێك هەیە إنقطاع.

(ابن معين قال يزيد بن الهيثم عنه: روى عنه بديل في التفسير ، ولم يسمع من ابن عباس شيئا ، فروى مرسلا). واتا: ابن مەعین دەڵێ: یەزیدی کوڕی هەیثەم دەربارەی عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة دەڵێ: هیچ شتێکی لە ابن عباس گوێ لێ نەبووە، بەڵکو ئەوەی لێی دەگێڕێتەوە مورسەلە واتا: پچڕانێك هەیە لەسەنەدەکەی بەهۆی نەبوونی کەسی نێوان عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة و ابن عباس.

(احمد بن حنبل: قال الميموني عنه : علي بن أبي طلحة له أشياء منكرات) واتا: ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: الميمونى دەربارەی عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة گوتویەتی: عَلِي بْن أَبِي طَلْحَة شتەکانی مونکەڕن و نەویستراون.

(ابن حجر العسقلاني: قال في تقريب التهذيب : أرسل عن ابن عباس ولم يره، صدوق قد يخطئ) واتا: عَلِي بْن أَبِي طَلْحَة ابن عباسى نەبينيوە، ڕاستگۆيەو هەڵەشى كردووە.

(صالح بن محمد جزرة قد سُئِل عن علي بن أبي طلحة: ممن سمع التفسير؟ قال: من لا أحد.) (أخرجه الخطيب البغدادي في تاريخ بغداد ١١/٤٢٨ بسند صحيح). واتا: پرسيار كرا دەربارەى عَلِي بْن أَبِي طَلْحَة تەفسيرى قورئانى لەكێ گوێ لێ بووە؟ گوتى: لەهيچ كەسێكى گوێ لێ نەبووە.

(قال أبو بكر أحمد بن علي بن منجويه الأصبهاني: تفسير علي بن أبي طلحة غير معتمَد في كتابه) واتا: تەفسيرى عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة باوەڕ پێكراو نييە!

(قال الخليلي: أجمع الحفاظ على أن ابن أبي طلحة لم يسمعه من ابن عباس) (الإرشاد ١/٣٩٤) واتا: هەموو گەورە زاناياني حوففاظ لەسەر ئەوە كۆكن كە عَلِي بْن أَبِي طَلْحَة گوێى لە ابن عباس نەبووە !!

(الفسوي: هو ضعيف الحديث منكر ليس بمحمود المذهب. وقال في موضع آخر: علي بن أبي طلحة أبو الحسن الهاشمي شامي ليس هو بمتروك ولا هو حجة). واتا: فەرموودەکەی لاوازە و مونکەڕە و ڕێگاکەی باش نییە، لەشوێنێکی تر دەڵێ: عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة نە حوججەیە و نەواز لێ هێنراوە.

(ابن اليتيم: لم يسمع من ابن عباس التفسير). واتا: عَلِي بْن أَبِي طَلْحَة گوێی لە ابن عباس نەبووە.

(قال ابن حبان: روى عن ابن عباس و لم يراه). واتا: شتی لە ابن عباس گێڕاوەتەوە بەڵام نەیدیوە.
((قال دُحيم: علي بن أبي طلحة لم يسمع تفسير من ابن عباس). واتا: عَلِيّ بْن أَبِي طَلْحَة گوێی لەتەفسیری ابن عباس نەبووە !!

گوتم: ئەی ئەو کەسەی کە اللَّه تعالى نیعمەتی فەهم و بەصیرەتی پێ بەخشیوی بۆت ڕوون بوویەوە بە کۆدەنگ لە سەلەف و خەلەف ئەو سەنەدەیان بە لاواز داناوەو مونقەتیعە و لەسەنەدەکەی پچڕان هەیە ئەوانەشی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە واسیتە لەنێوانیان هەبووە ئەگەر واشبێ ئەوە ناتوانن لاوازیەکەی علي ابن أبي طلحة لابدەن کە زەعیفە ئیتر چ شتێك وات لێدەکات نکوڵی بکەی و بیکەی بەبەڵگە !!؟

ڕیوایەتی نۆیەم: (حدثنا وهب بن بقية؛ قال: حدثنا خالد عن عطاء بن السائب عن سعيد بن جبير عن ابن عباس؛ قال: نعم القوم أنتم؛ إن كان ما كان من حلو فهو لكم وما كان من مر فهو لأهل الكتاب؛ كأنه يرى أن ذلك في المسلمين؛ الآيات الثلاث؛ الكافرون الظالمون الفاسقون) (أخبار القضاة(٤١/١)). واتا: ئێوە باشترین هۆزن گەر شیرین و باش بێ بۆ ئێوەیە گەر تاڵ و سەختیش بێت بۆ ئەهلی کیتابە پێیوابوو کە ئەم ئایەتانە الكافرون الظالمون الفاسقون بۆ موسڵمانانە.

لەسەنەدەکەی لاوازی هەیە پیاوێکی تێدایە بەناوی عطاء بن السائب کە ئاخیری تەمەنی توشی تێکەڵی بووەو گۆڕاوە، وە خالد لەکاتی تێکەڵکردنی ئەوەی لێ گێڕاوەتەوە !! لە سير أعلام النبلاء هاتووە دەربارەی عطاء بن السائب دەڵێ: (وَكَانَ مِنْ كِبَارِ العُلَمَاءِ لَكِنَّهُ سَاءَ حِفْظُهُ قَلِيْلاً فِي أَوَاخِرِ عُمُرِهِ) ((سير أعلام النب(٢٦٣/٦)). ترجمته في طبقات ابن سعد "٦/ ٣٣٨"، التاريخ الكبير "٦/ ترجمة ٣٠٠٠"، الجرح والتعديل "٦/ ترجمة ١٨٤٨"، تاريخ الإسلام "٥/ ٢٧٧"، الكاشف "٢/ ترجمة ٣٨٥٣"، ميزان الاعتدال "٣/ ٧٠-٧٣"، العبر "١/ ٢٨٤"، تهذيب التهذيب "٧/ ٢٠٣"، خلاصة الخزرجي "٢/ ترجمة ٤٨٥٣"، شذرات الذهب "١/ ١٩٤)).واتا: لەهەر گەورە زانایان بووە بەڵام لە کۆتاییدا حیفظفي خراپ بووە.

(عليُّ بنُ المَدِيْنِيِّ عَنْ يَحْيَى بن سَعِيْد قَالَ: مَا سَمِعْتُ أَحداً يَقُوْلُ فِي عَطَاءِ بن السَّائِب شَيْئاً قَطُّ فِي حَدِيْثِه القَدِيْم, وَمَا حَدَّث سُفْيَانُ وَشُعْبَةُ عَنْهُ صَحِيْحٌ, إِلاَّ حَدِيْثَيْنِ كَانَ شُعْبَةُ يَقُوْلُ: سَمِعْتُهمَا بِأَخَرَةٍ، عَنْ زَاذَانَ) (سير أعلام النب(٦/٢٦٤)).

واتا: عەلی کوڕی مەدینی لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەڵێ: هەرگیز گوێم لە هیچ کەسێك نەبووە دەربارەی فەرموودەی قەدیمی عَطَاءِ بنِ السَّائِبِ هیچ شتێك بڵێ، وە ئەوەی سوفیان و شوعبە لێی دەگێڕنەوە ڕاستە، ئیلا دوو فەرموودە نەبێ شوعبە دەیگوت: گوێم لێ بووە لەکۆتاییکەی لە زادانەوە.

(قال أَحْمَدُ بنُ حَنْبَلٍ عَطَاءٌ ثِقَةٌ ثِقَةٌ, رَجُلٌ صَالِحٌ. وَقَالَ: مَنْ سَمِعَ مِنْهُ قَدِيْماً كَانَ صَحِيْحاً). (سير أعلام النب(٦/٢٦٤) واتا: ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: عەطاء باوەڕ پێکراوە، پیاوێکی صاڵحە، وە دەڵێ: هەرکەسێك گوێی لە عەطاء بووبێ لەقەدیمەوە ئەوە دروستەو صەحیحە.

(كَانَ يَرْفَعُ، عَنْ سَعِيْدِ بن جبير أشياء لم يكن يرفعها) (سير أعلام النب(٦/٢٦٤).

واتا: شتانێکی بۆ لای سەعیدی کوڕی جوبەیر بەرزدەکردەوە کە سەعیدی کوڕی جوبەیر بەرزی نەکردۆتەوە (واتا: گوایە سەعید وای وتووە کەچی واشی نەگووتوە، وەکو ئەو ئەثەرە کە بۆلای سەعید بەرزی کردۆتەوە !!).

(وَقَالَ وُهَيْبٌ: لَمَّا قَدِمَ عَطَاءٌ الْبَصْرَةَ, قَالَ: كَتَبتُ عَنْ عَبِيْدَةَ ثَلاَثِيْنَ حَدِيْثاً, وَلَمْ يَسْمَعْ مِنْ عَبِيْدَةَ شَيْئاً, وَهَذَا اخْتلاَطٌ شَدِيْدٌ). (سير أعلام النب(٢٦٤/٦). واتا: وهەیب دەڵێ: کاتێك عەطاء هاتە بەصرا وتی: سی فەرموودەم لە عوبەیدە گێڕاوەتەوە، کەچی هیچ شتێکیشی لە عوبەیدە گوێ لێ نەبووە، ئەوەش تێکەڵکردنێکی زۆر توندە.

(قَالَ يَحْيَى: لَمْ يَسْمَعْ عَطَاءُ بنُ السَّائِب مِنْ يَعلَى بن مُرَّةَ قَالَ وَاخْتلط عَطَاءٌ فَمَا سُمِعَ مِنْهُ قَدِيْماً فَهُوَ صَحِيْحٌ, وَقَدْ سَمِعَ مِنْهُ أَبُو عَوَانَةَ فِي الصَّحَةِ وَفِي الاخْتِلاَطِ جَمِيْعاً, وَلاَ يُحْتَجُّ بِحَدِيْثِه)). ((سير أعلام النب(٢٦٤/٦)). واتا: یەحیا دەڵێ: عَطَاءُ بنُ السَّائِبِ گوێی لە يَعلَى بن مُرَّةَ نەبووە، عَطَاءُ بنُ السَّائِبِ تێکەڵی کردووە، جا ئەوەی لە کۆنەوە گوێی لێ بووە صەحیحە، لەوانەی گوێیان لێ بووە بریتییە لە : أَبُو عَوَانَةَ لە کاتی باشی و تێکەڵکردنی، وە ئتجاجبە فەرموودەکانی ناکرێت.

(قال يَحْيَى ابن مَعِيْن: لَيْثُ بنُ أَبِي سُلَيْم ضَعِيْفٌ مِثْلُ عَطَاءِ بن السَّائِب. وَجَمِيْعُ مَنْ رَوَى عَنْ عَطَاءٍ فَفِي الاخْتلاَطِ إِلَّا شُعْبَةَ وَسُفْيَانَ). (سير أعلام النب(٢٦٤/٦)). واتا: يَحْيَى ابن مَعِيْن دەڵێ: لَيْثُ بنُ أَبِي سُلَيْم لاوازە وەکو عَطَاءِ بن السَّائِبِ وە هەموو ئەوانەی لە عَطَاءِ بن السَّائِبِ یان گێڕاوەتەوە لەکاتی تێکەڵ کردنی بووە ئیلا شوعبەو سوفیان نەبێ.!!

(قَالَ ابْنُ عَدِيٍّ: عَطَاءٌ اخْتلطَ فِي آخِرِ عُمُرِه, فَمَنْ سَمِعَ مِنْهُ قَدِيْماً مِثْلُ الثَّوْرِيِّ, وَشُعْبَةَ فَحَدِيْثُه مُسْتقِيْمٌ وَمَنْ سَمِعَ مِنْهُ بَعْدَ الاخْتلاَطِ فَأَحَادِيْثُهُ فِيْهَا بَعْضُ النَّكِرَةِ وَقَالَ العِجْلِيُّ كَانَ شَيْخاً, قَدِيْماً, ثِقَةً رَوَى، عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى وَمَنْ سَمِعَ مِنْهُ قَدِيْماً فَهُوَ صَحِيْحٌ مِنْهُمُ الثَّوْرِيُّ فَأَمَّا مَنْ سَمِعَ مِنْهُ بِأَخَرَةٍ فَهُوَ مُضْطَرِبُ الحَدِيْثِ مِنْهُم هُشَيْمٌ وَخَالِدُ بنُ عَبْدِ اللهِ). (سير أعلام النبلاء (٦/٢٦٤)).

واتا: ابْنُ عَدِيٍّ دەڵێ: عَطَاءِ بنِ السَّائِبِ لەکۆتایی تەمەنی تێکەڵی کردووە، جا هەرکەسێك لەکۆندا گوێی لێ بووبێ وەکو شوعبەو سوفیانی کوڕی ثەوری ئەوە گێڕانەوەکەی دروستە، وە هەرکەسێك گوێی لێ بووبێ لەدوای تێکەڵکردنیەو گێڕانەوەکانی مونکەڕی تێدایە !! العِجْلِيُّ دەڵێ: عَطَاءِ بنِ السَّائِبِ سەرەتا لێهاتوو و شێخ بوو و باوەڕ پێکراو بوو لە ابْنِ أَبِي أَوْفَى ی گێڕاوەتەوە، جا هەرکەسێك لەکۆندا گوێی لێ بووبێ ئەوە گێڕانەوەکەی دروستەو صەحیحە لەوانە سوفیانی ثەوری، بەڵام کەسێك لە کۆتاییەکەی گوێی لێ بووبێ و لێی گێڕابوبێتەوە، ئەوە فەرمودەکەی مضطربە، لەوانەی کە لەکاتی تێکەڵکردنی لێیان گێڕاوەتەوە : هُشَيْمٌ وَخَالِدُ بنُ عَبْدِ اللهِ.

گوتم: وتەکەی العِجْلِيُّ ڕوونەو بەڕوونی دەڵێ خالد لەکۆتاییکەی لەکاتی تێکەڵ کردنی عَطَاءِ بنِ السَّائِبِ ئەو ڕیوایەتەی لێ گێڕاوەتەوە هەروەکو لەسەنەدەکە هاتووە: ((حدثنا خالد عن عطاء بن السائب). !!

(قَالَ أَبُو حَاتم: كَانَ مَحَلُّهُ الصِّدْق قَدِيْماً قَبْلَ أَنْ يَختلط, ثُمَّ تغير حفظه, فِي حَدِيْثِه تَخَالِيطٌ كَثِيْرَةٌ, وَمَا رَوَى عَنْهُ ابْنُ فُضَيْل فَفِيْهِ غَلَطٌ وَاضْطِرَابٌ, رَفَعَ أَشْيَاءَ كَانَ يَروِيهَا، عَنِ التَّابِعِيْنَ, فَرَفَعَهَا إِلَى الصَّحَابَة) (سير أعلام النب(٦/٢٦٤).
واتا: أَبُو حَاتِم دەڵێ: عَطَاءِ بن السَّائِب لەکۆندا جێگای باوەڕ پێکراوبوو پێش ئەوەی تێکەڵ بکات، پاشان حیفظی گۆڕا لە گێڕانەوەکانی تێکەڵکردنی زۆر هەیە! وە ئەوەی ابْنُ فُضَيْلٍ لێی دەگێڕێتەوە، هەڵەیەو مضطربە، شتانێکی دەگێڕاوە، لە تابیعیەکان، کەچی بەرزی دەکردەوە بۆلای صەحابەکان !!

خوێنەری بەڕێز بزانە کە هیچ ڕیوایەتێك لە صەحابەی بەڕێز ابن عباس جێگیر نەبووە دەربارەی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە بێجگە لە ڕیوایەتە نەبێ کە دەڵێ: (هِيَ بِهِ كُفْر) واتا: ئەمە کوفرە.
یان دەڵێ: (كَفَى بِهِ كُفْرُهُ) واتا: ئەوەندەی بەسە کە بە کافر ناوی هاتوە اللَّه کافری کردوە.

هەروەکو ئیمامی عبداللَّهی کوڕی موبارەك دەڵێ: (بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْقَوَائِمُ، يَعْنِي الْإِسْنَادَ). (مقدمة مسلم) واتا: عبداللَّهی کوڕی موبارەك دەڵێ: لەنێوان ئێمەو لەنێوان خەڵکی پەیژەکانە، واتا: ئیسنادە. بۆیە لەنێوان ئێمەو ئێوە ئیسنادە.

جا ئەو ڕیوایەتە صەحیحانەی لە ابن عباس هاتووە بریتییە لەوانە:

یەکەم: (قال الإمام عبد الرزاق الصَّنْعاني في " تفسيره : أخبرنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه قال: سئل ابن عباس عن قوله : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّه فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ قال: هي به كفر). واتا: پرسیارکرا لە ابن عباس دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَمن لَّمْ يَحكُم بِمَا أَنْزَلَ اللَّه فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾. فەرمووی: (هِيَ بِهِ كُفْرٌ) واتا: ئەمە کوفرە. (تفسير ابن كثير " ( ٢ / ٩٧ ) وعلَّقه أبو عُبيد في " الإيمان " ( ص ٩٤ ) ، والبغوي في " معالم التنزيل " ( ٢ / ٢٦٠ ) .

دووەم: بە سەنەدی تر هاتوە بە صەحیحی پرسیار کراوە لە ابن عباس لە ئایەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ لە وەڵام وتویەتی: ئەوەندەی بەسـە کە بە کافر ناوی هاتوە و اللّٰه تعالی کافری کردوە.

(حدثنا الحسن بن أبي الربيع الجرجاني قال: أخبرنا عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه قال : سُئل ابن عباس عن قوله : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾؟ قال: كفى به كفره). (أخرج وكيع في أخبار القضاة ٤١/١).
واتا: پرسیار کرا لە ابن عباس الله لێ ڕازی بێت لە تەفسیری ئایەتی : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ فەرمووی: ئەوەندەی بەسـە کە بە کافر ناوی هاتوە و اللّٰه کافری کردوە.

جا گوتم: لێرە پرسیارێك لەوانە دەكەین كەوا ئەو ڕیوایەتانە دەكەنە بەڵگە بۆخۆیان بۆ واز لەو ڕیوایەتانە دەهێنن كە صەحیحن؟!! ئایە ئەو ڕیوایەتەتان لێ ون بووە یاخود شاردوتانەوە؟ یانیش درکتان پێی نەکردووە؟! ئیمامی وەکیع ڕاستی گوت، کاتێك وتی: (أهل العلم يكتبون ما لهم وما عليهم، وأهل الأهواء لا يكتبون إلاَّ ما لهم) سنن الدارقطني (١/ ٤٣)، رقم (٣٩)). واتا: ئەهلی عیلم ئەوەی لەدژی خۆیانەو ئەوەشی بۆبەرژەوەندی خۆیانە دەینوسن، وە ئەهلی هەوا ئیلا ئەوەی لەبەرژەوەندی خۆیانە دەبنوسن. واللَّه المستعان.

ئەگەر پرسیارکەرێك بپرسێت و بڵێ: باشە خۆ ابن عباس دەڵێ: هِيَ بِهِ كُفْرٌ واتا: بەو شتە کافر بووە، وشەی کفر لێرەدا بە مەعریفە نەهاتووە واتا: ئەلف و لامی پێوە نە لکاوە فەرموودەش هەیە بەو جۆرە کە رسول اللَّه دەفەرموێت: (اثنتانِ في الناسِ هما بهم كفرٌ : الطعنُ في الأنسابِ، والنِّياحةُ على الميِّتِ) (أخرجه مسلم:٦٧)). دەڵێن ئەو فەرموودەش هەمان لەفزی هە یە ئایە رسول اللَّه ئەو کارەی بە کوفری گەورە داناوە؟

تێبینی: ئەو فەرموودە مەبەست پێی کوفری گەورە نییە بەڵکو کوفری بچووکە هەروەکو چۆن زانایان ڕوونیان کردۆتەوە.

## لە وەڵامدا دەڵێین:

یەکەم: ئەگەر وشەی (الكُفْر، والكَافِر، والكُفَّار، والكَافِرُون الكَافِر) لە قورئان و فەرموودە هات ئەوا کوفری گەورەیە، زانایانی زمانەوانی دەڵێن: جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان لەفزی کوفرێك کە بەشێـوەی نکرة نەناسراوە هاتبێت وەك: (كُفْر، وكافر، وكُفار، وكافرون) لەگەڵ ئەوەی بەشێوازی مەعریفە هاتبێت کە (ال) ئەلیف و لامی بچێتە سەر وەك (الكُفْر، والكافر، والكفار، والكافرون).

بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بەشێوەی مەعریفە (ناسراو) هات ئەوا مەبەستی لەوەیە کە کوفری گەورەیە ئەمیش بەهۆی چوونی (الــ) بۆسەری کە دەبێتە هۆی ئەوەی بیبات بەرەو ئەوپەڕی زیادەڕۆییەوە ئەمەش هیچ خیلافێکی تێدا نییە لەنێوان زانایانی زمانەوانیدا، ئەگەر تۆ گوتت: (عمر الشجاع) بەشێوەی مەعریفە ئەوە مانای ئەوەیە کە عومەر گەشتۆتە ئەوپەڕی بەهێزی و بەتوانایی، بەڵام ئەگەر بڵێین: (عمر شجاع) بەشیوەی نەکیرە ئەوە مانای ئەوەنادات کە تەواو بەهێزە. بڕوانە ئەو سەرچاوانە: (الإيضاح في علوم البلاغة) للخطيب القزويني، ط دار الكتب العلمية ١٤٠٥هـ، صـ: ١٠١))، (الصلاة) لابن القيم، ط دار الكتب العلمية، صـ: ١٨)).

جا كاتێك دەگوترێ فلان بێباوەڕە (فلان الكافر) بەشێوەی مەعریفە ئەوا هەواڵدان و حوكمدانە بەسەری بەوەی كوفری گەورەیە بەهۆی هەواڵە لەوەی كە كوفرەكە هاتووە بەشێوەی مەعریفە بەڵگەیە لەوەی كە گەشتۆتە ئەوپەڕی ڕادەی كوفر، بەهەمان شێوەی فەرمایشتی اللَّه تعالى ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ئەوە هەواڵە دەربارەی ئەو كەسانە كە گەشتونەتە ئەوپەڕی ڕادەی كوفر .

دووەم: هەموو كوفرێك كە لەقورئاندا بەشێوەی مەعریفە هاتبێت (ال) ی پێوە لكابێت ئەوا كوفری گەورەیە وە لەسوننەتیش بەهەمان شێوە بەڵام لەسوننەتدا واتا فەرموودە جیاوازە وەك لەفزی: (كُفْر، وكافر، وكُفار، وكافرون) چونكە ئەلف و لامەكە مانای قوڵ بوون و پێداگری دەدەن بۆ تەواوی و قوڵی ماناكەی ئەمەشیان هیچ خیلافێكی لەسەر نییە لەنێوان ئەهلی عیلم و زانایانی زمانەوانییدا، هەموو كوفرێك كە لەقورئاندا هاتووە كوفری گـەورەیە جا بەشێوەی (اسم) بێت یاخود بەشێوەی (فعل) یاخود بەشێوەی (مصدر) ئەمەشیان جێگیربووە لەقورئاندا، تەنها لەقورئاندا ئەوەی یەكدەنگی لەسەرە كە كوفری بچووكە بریتیە لەكوفری نیعمەت، ئەوەشی كە دەمێنێتەوە لەو لەفزانەی كەهاتووە لەسوننەتدا بەشی زۆری ئەوەی بەشێوەی معریفە هاتوە كە (ال) چووەتە سەر ئەوا مەبەست پێی لەكوفری گەورەیە تەنها ئەوانەی كە بەڵگەیەك هاتووە لەبارەی ئەوەی كە

تاییەتی بکات بەوەی کوفری بچوك بێت، هەروەکو لەهەندێك لەفەرموودەدا هاتووە کە رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ بينَ الرَّجُلِ وبينَ الشِّرْكِ والْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ) واتا: لەنێوان کوفر و موسڵماندا بریتییە لە وازهێنان لە نوێژ.

ئەگەر سەیری بکەین لەو فەرموودەیەدا: (إنَّ بينَ الرَّجُلِ وبينَ الشِّرْكِ والْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ) وشەی: (الكفر) کوفر (ال) ـی پێوە لکاوە ئەمەش واتای ئەوەیە کە کوفری گەورەیە.

هەروەکو ابن تیمیە دەفەرموێت: (فَرْقٌ بين "الكُفْر" المعَرَّف باللَّامِ كما في قوله: ليس بين العبد وبين الكفر أو الشرك إلا ترك الصلاة" وبين كفر مُنَكَّر في الإثباتِ). (إقتضاء الصراط المستقيم: (٦٩) واتە: جیاوازی هەیە لەنێوان کوفری مەعریفە کە (ال)ی پێوە لکاوە و لەنێوان کوفری نەکیرە هەروەک چۆن رسول اللّٰه ﷺ دەفەرموویێت: لەنێوان بەندە و کوفرو شیرك وازهێنانە لە نوێژ.

أبو حيـان الأندلـسي دەڵێ: (الكفر إذا أطلق انصرف إلى الكفر في الدين) (البحر المحيط) ٣/ ٤٩٣). واتا: ئەگەر وشەی الكفر هات (ئەلف لامی پێوە لکا) ئەوە مەبەست پێی کوفرە بەدین.

ابنُ باز دەڵێ: (الكُفْرُ المُطلَقُ المعَرَّف بأداةِ التَّعريف، كقَولِه عليه الصَّلاةُ والسَّلامُ: (بين الرَّجُلِ وبين الكُفرِ والشِّرْكِ تَرْكُ الصَّلاةِ) ... هو الكُفْرُ الأكْبَرُ، في أصَحِّ قَولَيِ العُلَماءِ) (مجموع فتاوى بان باز)) (٤٥٢/٣). واتا: وشەی کوفر رەها ناسراوە بە ئەداتی ناسراو، وەکو وتەکەی رسول اللّٰە ﷺ: لەنێوان بەندە و کوفرو شیرك وازهێنانە لە نوێژ. ئەوە کوفری گەورەیە لەڕاسترین دوو وتەی زانایان.

بەڵام ئەگەر بەو صیغەیە نەهاتبوو: ئەوا ئەصڵ لەوەیە کە دابمەزرێت لەسەر کوفری گەورە تاوەکو بەڵگە هەبێ ڕونی بکاتەوە کە کوفری بچوکە بەڵگە ئەوەیە کە فەرموودەی: (کفران العشیر) نەتبینیوە کە رسول اللّٰە ﷺ دەربارەی ئافرەتان فەرمووی: کوفر دەکەن (یکفرن) هاوەڵان فەرموویان ئایا کوفر بە دەکەن!؟ ئەمە بەڵگەیە لەوەی کە کوفر هات بەشێوەی (الکفر) ئەوا لەسەر ئەوە دادەمەزرێت کەکوفری گەورەیە مەگەر بەڵگە هاتبێت لەوەی ڕوونی بکاتەوە کە کفری بچووکە هەر وەکو لەنموونەی پێشوودا باسکرا .
شێخ عبداللطیف بن عبدالرحمن دەفەرمووێت: (ولفظ الظلم والمعصية والفسوق والفجور والموالاة والمعاداة والركون والشرك ونحو ذلك من الألفاظ الواردة في الكتاب والسنة قد يراد مُسَّماها المطلق وحقيقتها المطلقة، وقد يُراد بها مطلق الحقيقة، والأول هو الأصل عند الأصوليين، والثاني لايُحمل الكلام عليه إلا بقرينة لفظية أو معنوية، وإنما يُعرف ذلك بالبيان النبـوي وتفسير

السنة). (الرسائل المفيدة: (٢٢/٢١). واتا: لەفزی ستەم و تاوان و فسق خراپە و دۆستایەتی و دوژمنایەتی و مەیل بۆ کافران و شیرك (ئەلف و لامی پێوە لکابێت) لەو لەفزانەی کەهاتووە لەقورئان و سوننەتدا لەوانەیە مەبەستی لەکوفری گەورە بێت و لەوانەشە مەبەستی لە کوفری بچووك بێت، یەکەمیان ئەصڵە و دروستە لای زانایانی ئوصولی دووەمیشان لەسەری دانامەزرێت مەگەر بەبەڵگەیەك نەبێت، ئەمیشیان بەوە ڕوونکردنەوەی پەیامبەرایەتی و تەفسیرکردنی سوننەت دەزانرێت.

سێیەم: ئەگەر کوفر بەشێـوەی نەکیرە هات (ال) ـی پێوە نەلکابوو، ئەوا لەسەر ئەوە دادەمەزرێت کە کوفری بچووك و گەورەیە، بۆ زانینی ئەوەش کە ئایا کوفری گەورەیە یاخود بچووکە ئەوا سەیری قورئان دەکرێت بەکۆکردنەوەی بەڵگەکان لەو بارەیەوە ئەم بنەمایەش جێبەجێ دەکرێت لەسەر ئەو کوفرانەی کە لەسوننەتدا بەشێوە نەکیرە هاتوون، بەڵام لە قورئاندا هەمووئەو کوفرانەی کە بەشێوەی معریفە یاخود نەکیرە هاتوون ئـەوا کوفری گەورەن تەنها کوفری نیعمە نەبێت ئەو جۆرە کوفرە هەندێك لە زانایان بۆی چوون کە کوفری گەورەیە بەڵام ئەوەی دروستە بە کۆکردنەوەی بەڵگەکان کوفری بچوکە ئەویش بەپێی حالەتی کەسەکە.

هەندێك لەو کوفرانەی کە بەشێوەی نەکیرە هاتوون لە قورئاندا و (ال) پێوەنیە بەڵگەن لەوەی کوفری گەورەن:

وەك ئایەتی: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا﴾ .(سورة البقرة: ١٠٩). واتا: زۆرێك لە ئەهلی کتاب لە جوولەکەو گاور لە دوای ئەوەی کە ئێوە ئیمانتان هێناوە ئەیانەوێت پاشگەزتان بکەنەوەو هەڵتانگەڕێننەوەو کافر ببنەوە.

وە ئایەتی: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ﴾. (سورة البقرة: ٢١٧). واتا: هەرکەسێك لەئێوە لە دین پاشگەز ببێتەوە ، ئەوە کافرە.

وە ئایەتی: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾. (سورة المائدة: ٦٨). واتا: سوێند بێت بە اللَّه تعالی زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لەکوفردا.

وە ئایەتی: ﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَا تاوەك ئایەتی: فَكَيْفَ آسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾.(سورة الأعراف: ٩٢_٩٣). واتا: ئەوانەی کە شوعەیبیان بەدرۆ زانی وەك ئەوەی کە لەو شوێنەدا هەر نەبوو بێتن لەبەر ئەوەی اللَّه تعالی ڕیشەکێشی کردن. تاوە ئایەتی: ئیتر چۆن من خەفەت بخۆم لە کەسانێك کە کافرن.

وە ئایەتی: ﴿وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾.(سورة الإسراء: ٢٧). واتا: شەیطانیش بەرامبەر پەروەردگاری زۆر کوفری کردووە.

وە ئایـەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ﴾.(سورة سبأ: ٣٤). واتا: ئێمە بۆ هیچ شارێك پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیلا دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارە خراپەکان وتوویانە ئێمە بێباوەڕین بەو تەوحیدو ئیمان و دینەی کە ئێوەی پێ نێردراون و باوەڕمان پێی نیە.

ئەم ئایەتانە بەولەفزانەی (کُفاراً، کافر،کُفْراً، کافرین، کفوراً، کافرون) کە هاتوون لەو ئایەتانە هەمووی بەشێوەی نەکیرە هاتوون واتە (ال) پێوەنییە لەکاتێکدا بەڵگەن بۆ کوفری گەورە بەم شێوەیە هەموو کوفرێك هاتبێت لە قورئان .

بەڵام هاتنی کوفر بە شێوەی نەکیرە (کفر) لە سوننەتدا ئەوا لەسەر ئەوە دادەمەزرێت لەسەر کوفری گەورە و بچووکە وەك رسول اللَّه ﷺ دەفەرموویێت: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وقِتَالُهُ كُفْرٌ) واتە: جنێودان بە موسڵمان لەسنور دەرچوونە وە شەڕکردن دژی کوفرە.

ئەمەش کوفری بچوکە بە یەکدەنگی ئەهلی عیلم بەو بەڵگەیە کە دوو موسڵمان یان کۆمەڵەیەك بووە شەڕیان کافر نابن ئەویش بە کۆکردنەوەی بەڵگەکان وەك اللَّه تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾.(سورة الحجرات: ٩). واتا: هەر دوو کۆمەڵە لەموسڵمانان بووە شەڕیان ئەواناوبژیوانیان بکەن.

بەوەشەوە دەردەکەوێت کە کوفری بچوکە چونکە اللَّه تعالى فەرموویەتی گەر موسڵمانان لەگەڵ یەکتریش شەڕ بکەن لەگەڵ ئەوەشدا ناوی بردوون بە ئیماندار، کەواتە لێرەدا قەرینەیەك هەیە کەڕوونی کردەوە ئەو کوفرە کوفری گەورەیە یان نا.

وە کوفریش هەیە کە بەشێوەی نەکیرە هاتووە (الـ) پێـوە نەلکاوە و بەڵگەشە لەوەی کوفری گەورەیە وەك فەرموودەی: (إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَواحًا) ئەمەشیان کوفری گەورەیە بەیەکدەنگی زانایان لەگەڵ ئەوەی کە بە شێوەی نەکیرە هاتووە چونکە کوفری ڕوون و ئاشکرا و قوڵە (کوفری بەواح) بەڵگەیە لەوەی کە کوفرەکە کوفری گەورەیە، وەك فەرموودەی: (بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، أَوْ يُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا،يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا). (أخرجه مسلم). واتا: پەلە بکەن لە ئەنجامدانی کردەوەی چاکە پێش ئەوەی چەند فیتنەیەك ڕووبدات کە وەکو بەشێکی تاریك وایە لە شەودا (واتە: فیتنەکان زۆر ئاڵۆزن و چاکە و خراپە تێیدا ڕوون نییە)، بەهۆی ئەم فیتنانە پیاوی واهەیە بەیانی دەکاتەوە ئیماندارە، بۆ ئێوارە کافربووە، یاخود ئێوارە دەکاتەوە ئیماندارە بۆ بەیانی کافربووە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی دینەکەی بە شتێك لە دونیا دەفرۆشێت و دەگۆڕێتەوە)، ئەم کوفرەش کە لەو فەرموودەیەدا هاتووە بەشێوەی نەکیرە هاتووە بەڵام کوفری گەورەیە بەو بەڵگەیەی کە رسول اللَّه ﷺ کردوویەتی بە دژی ئیمان و بە بەڵگەی ئەوەی دینەکەی دەفرۆشێت. وەهەروەها بەڵگەیەتریش کە بە کفر بەمانای کوفری گەورە دێت ئیمامی الدارمی لە سونەنەکەیدا کاتێك باسی ئەو فەرموودە دەکات: (إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ)) دەڵێ: ((الْعَبْدُ إِذَا تَرَكَهَا مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ وَعِلَّةٍ لَا بُدَّ مِنْ أَنْ يُقَالَ : بِهِ كُفْرٌ). (سنن الدارمي (١٢٦٩). واتا: ئەگەر بەندە وازی

له نوێژ هێنا بەبێ هیچ عوزرێك و نەساغیەك، ئەوه پێویسته بگوترێت: بەو شته کافر بووه. گوتم: ئەوه بەڵگەیەکی ڕوونه که ئەو لەفزە: (بِهِ كُفْرٌ) مەبەست پێی کوفری گەورەیه هەروەکو چۆن ئیمامی دارەمی ئاماژەی پێدا.

جا پوختەی وته: ئەوەی باسکرا ئەوەیه ئەصڵ ئەوەیه که هەرکاتێك کوفرێك له قورئان و سوننەت هات ئەوا دادەمەزرێت لەسەر کوفری گەوره تاوەکو بەڵگەیەك هەبێت دایبمەزرێنێت و ڕوونی بکاتەوه بەوەی کوفری بچوکه وەك رسول اللَّه ﷺ دەربارەی ئافرەتان فەرموو کوفر دەکەن هاوەڵان فەرموویان ئایا کوفر به اللَّه تعالى دەکەن؟ بۆیه هاوەڵان بەکوفری گەوره تێگەشتن، بەڵام رسول اللَّه ﷺ بۆیانی ڕوون کردەوه کاتێك فەرمووی: (يكفرن العشير) کوفر به چاکەی هاوسەرانیان دەکەن ئا بەو شێوەیه هەموو لەفزێکی کوفر و شیرك لەسەر ئەوه دادامەزرێت، کەواته لێرەدا جۆری کوفری ئایەتی: ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ کوفری گەورەیه نەوەك بچوك بێت .

## ئەگەر پرسیارکەرێك بپرسێت باشە ئێوە چۆن درکتان بەعیللەتی ئەو ئەثەرەی ابن عباس کرد لەکاتێکدا سەلەفی صاڵح درکیان پێ نەکردووە ؟

### لە وەڵامدا دەڵێین:

زانستی عیلەلی فەرموودە: دەربارەی وەسفی ئەو زانستە گوتراوە: بریتیە لە شاراوەترین و دەقیقترین و گەورەترین زانستی فەرموودە، بەکۆ دەنگی هەموو زانایانی فەرموودە لەمتقدمین و متأخرین، جا لەبەر ئەوە دروست و ڕەوا نییە بۆ هیچ کەسێک لەو زانستە ڕۆچێ ئەگەر هاتوو ئەهلی ئیختیصاصی تەواو نەبێ، هەروەکو لەپێشوودا ئاماژەمان بەزانستی عیلەلدا، ئێستاش ئاماژە بەو زانستە دەدەین لە دەمی ئەهلەکەیدا کە زانایانی زانستی فەرموودە پەلەیان نەکردووە لە حوکمدان لەسەر فەرموودە و ئیسنادەکەی و بەڕووکەشی سەنەدەکەی هەڵنەخەڵتاون بەڵکو جار وابووە کاتێکی زۆر ماونەتەوە بۆ زانینی صیحەت و دروستی سەنەدێك، وە سەلەفی صاڵح درکیان بەە کردووە ئەوە ئێوە بێ ئاگان و لەو زانستە نازانن، جا پشتیوان بە اللَّه تعالى باسیان دەکەین:

سەرەتا ئاماژە بەوتەیەکی ئیمامی عەلی دەکەین کە دەڵێ: (كُنْتُ إذا سَمِعْتُ مِن رَسولِ اللَّه ﷺ حَديثًا نفعَني اللَّهُ به بما شاءَ أن ينفعَني منهُ ، وإذا حدَّثَني غيرُهُ استَحلفتُهُ ، فإذا حلَفَ لي صدَّقتُهُ). أخرجه أبو داود (١٥٢١)، والترمذي (٤٠٦)، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٠٢٥٠)، وأحمد (٥٦) واللفظ له. إسناده حسن. واتا: من کاتێك گوێم لە رسول اللَّه ﷺ بوایە، سوودی پێدەگەیاندم ئەوەندەی کە اللَّه تعالی ویستی لێبێ سوودی لێ ببینم، ئەگەر بێجگە لە رسول اللَّه ﷺ کەسێکی تر فەرموودەی بۆ بگێڕاباماوە سوێندم دەدا، ئەگەر سوێندی بخواردبا باوەڕم دەکرد پێی.

ئەوەش مانای ئەوە نییە کە ئیمامی عەلی بڕوای بەصەحابە نەبێت بەڵکو بۆ دڵنیا بوون ئەوەی دەکرد، چونکە صەحابە هەموویان ڕاستگۆن.

علي بن المديني کە زاناترین کەس بوو لەزەمانی خۆی بەزانستی عیللەل لەگەڵ ئەوشدا دەڵێ: (رُبَّمَا أَدْرَكْتُ عِلَّةَ حَدِيث بَعْدَ أَرْبَعِينَ سَنَةً) (تهذيب الكمال. ١٢/٢١) واتا: لەوانەیە دوای چل ساڵ بە عیللەتی فەرموودەیکدا گەیشتبم و زانیبێتم !

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: (الْحَدِيثُ إِذَا لَمْ تَجْمَعْ طُرُقَهُ لَمْ تَفْهَمْهُ) (الجامع لأخلاق الراوي للخطيب البغدادي، مكتبة المعارف، (٢/ ٢١٢). واتا: فەرموودە ئەگەر ڕێگاکانی کۆنەکەیتەوە تێیناگەی.

عەلی مەدینی دەڵێ: (الْبَابُ إِذَا لَمْ تَجْمَعْ طُرُقَهُ لَمْ يَتَبَيَّنْ خَطَؤُه) (الجامع لأخلاق الراوي للخطيب البغدادي، مكتبة المعارف، (٢/ ٢١٢). واتا: هەر باب و بابەتێك لە فەرموودە ئەگەر رێگاکانی کۆنەکەیتەوە هەڵەکەی دەرناکەوێ.

ئیمامی ئەحمەد دەربارەی عەلی کوڕی مەدینی دەیفەرموو: (أعلمنا بالعلل علي بن المديني) (المجروحين ١/ ٥٥). واتا: زاناترین کەس بەئێمە بەزانستی عیلەل عەلی کوڕی مەدینییە.

ئیمامی بوخاری دەربارەی دەڵێ: (مَا اسْتَصْغَرْتُ نَفْسِي عِنْدَ أَحَدٍ إِلَّا عِنْدَ عَلي بن المَدِيني) (فتح الباري. ١/٣٤٧). واتا: لەلای هیچ کەسێك خۆم بەبچوك نەزانیوە ئیلا لەلای عەلی کوڕی مەدینی نەبێ.

أبو عيسى الترمذي دەربارەی عیلمی عیلەل دەڵێ: (إِنَّهُ عِلْمٌ قَدْ هُجِرَ فِي هذا الزمان، وَقَدْ ذَكَرْنَا فِي كِتَابِ الْعِلْمِ أَنَّهُ عِلْمٌ جَلِيلٌ قَلَّ مَنْ يَعْرِفُهُ مِنْ أَهْلِ هذا الشَأْنِ) (شرح علل الترمذي (٢/٤٦٧)). واتا: زانستی عیلەلی زانستێکە لەو زەمانەدا هەجر کراوەو وازی لێ هێنراوە، وە لەکتابی زانست باسمان کردووە، کە زانستی عیلەل، زانستێکی زۆر گەورەیە زۆر کەمن ئەوانەی ئەو زانستە دەزانن. وتم: گەر ئیمام لەو زەمەنەی ئێمە بوایە دەبوایە چی بڵێ ؟!

ابن رجب دەڵێ: (معرفة مراتب الثقات، وترجيح بعضهم على بعض عند الاختلاف، إمّا في الإسناد، وإمّا في الوصل والإرسال، وإما في الوقف والرفع ونحو ذلك، وهذا هو الذي يحصل من معرفته وإتقانه وكثرة ممارسته الوقوف على دقائق علل الحديث). (شرح علل الترمذي ٢/٧٦٤- ٨٦٤ ). واتا: زانینی پلەی باوەر پێکراوەکان، وتەرجیح کردنی بەشێکیان بەسەر بەشێکی تریان لەکاتی ڕاجیایی، جا چ لەسەنەد بێت، یا لە وەصڵ و ئیرسال، یا لە وەقف و ڕەفع و هاوشێوەی ئەوە، جا ئەوە بەدەست دێت بە زانین و ئیتقان و زۆری مومارەسەکردن و ڕاوەستان لەسەر وردی ودەقیقی عیلەلی فەرموودە.

ئەبو حاتیمی رازی دەڵێ: (لَوْ لَمْ نَكْتُبِ الْحَدِيثَ مِنْ سِتِّينَ وَجْهًا مَا عَقَلْنَاهُ) (تدريب لراوي للسيوطي، دار طيبة، ٢/٥٩٤). واتا فەرموودە ئەگەر لە ٦٠ ڕووەوە نەینوسینەوە تێیناگەین، هەمان ئەو قسەیە لە ڕێی یەحیای کوڕی مەعینەوە هاتووە بەڵام ئەو دەڵێ: لە ٣٠ ڕوو (لَوْ لَمْ نَكْتُبِ الْحَدِيثَ مِنْ ثَلَاثِينَ وَجْهًا مَا عَقَلْنَاهُ). ((الجامع لأخلاق الراوي للخطيب البغدادي، مكتبة المعارف، ٢/٢١٢)).

الخطيب البغدادي دەڵێ: (فَمِنَ الْأَحَادِيث مَا تَخْفَى عِلَّتُهُ فَلَا يُوقَفُ عَلَيْهَا إِلَّا بَعْدَ النَّظَرِ الشَّدِيدِ، وَمُضِيِّ الزَّمَنِ الْبَعِيدِ). (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع (٢/٢٥٧)).

واتا: هەندێك فەرموودە هەن کە عیللەتەکەی شاراوەن لەسەری ڕاناوەستی ئیلا بەتەماشاکردنێکی زۆر توند و وە کاتێکی زۆر دوور.

گوتم: ئەوە گەورەیی زانستی فەرموودە و زانایانی فەرموودەناس دەردەخا و دەیسەلمێنێ کە حوکمدانیان لەسەر فەرموودە ئاوا سادە و ئاسان نەبووە.

پاشان دێین باسی بابەتی تەصحیح و تەضعیف کردنی فەرمووده دەکەین، ئایە چۆن کەسانێك فەرموودەیەك تەصحیح دەکەن کەچی لەبەرامبەردا کەسانێکی تر تەضعیفی دەکەن و بە لاوازی دەزانن ؟

لەوەڵامدا دەڵێین: خوێنەری بەڕێز بابەتی تەصحیح و تەضعیفکردنی فەرموودە، بابەتێکی ئیجتیهادیە، جا تۆی خوێنەر زۆر فەرموودە دەبینی نوسراوە: صححه فلان، واتا: فڵان کەس فەرموودەکەی بەصەحیح دانا، وە لەبەرامبەردا هەمان فەرموودە لەلایەن زانایەکی ترەوە حوکمی زەعیفی بەسەردادەدرێت دەڵێ: ضعفه فلان واتا: فڵان کەس فەرموودەکەی بەزەعیف دانا، جائەوەی لێرە پێم خۆشبوو باسی بکەم ئەوەیە هۆکاری ئەوە چییە؟ خوێنەری بەڕێز وەڵامەکەی بەوجۆرە دەبێ زانایان رحمهم اللَّه، بۆ دەرهێنان و دەستخستنی فەرموودە مەرجیان هەیە بۆ نمونە: تۆ دەبینی ئیمامی بوخاری هەندێک فەرموودەی گێڕاوەتەوە چونکە ئیعتیقادی وابووە صەحیحەو لەسەر مەرج و شەرتەکانی خۆی دەری هێناوەو گێڕاویتیەوە بەهەمان شێوە ئیمامی موسلیم واز لەوە هێناوە کە بوخاری گێڕاویتیەوە لەبەر ئەوەی لەسەر مەرج و شەرتی خۆی نەبووە، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە بابەتی تەصحیح و تەضعیفکردنی فەرموودە بابەتێکی ئیجتیهادییە، بۆ ئەوانەی کەئەهلی ئەو عیلمەن و بەو کارەهەستاون.

ئیمامی الصنعاني دەڵێ: (التصحيح والتضعيف من المسائل الإجتهادية النظرية). (إرشاد النقاد(ص٢) واتا: بابەتی تەصحیح کردن و تەضعیف کردنی فەرمووده بابەتێکی ئیجتیهادی و نەزەرِیە.

ابن وزير دەڵێ: (تصحيح الحديث ظني اجتهادي ولذلك اشتد الخلاف في شرائطه ألا ترى أن شرط البخاري غير شرط مسلم في الرجال والاتصال). (العواصم والقواصم (ص:٣٩٣) واتا: تەصحیح کردنی فەرمووده شتێکی مەزەندەکردن و ئیجتیهادیە، هەر بۆیەش ناکۆکیەک و خیلافەکی زۆر هەیە لەمەرجەکانی، ئایە نەتزانیەوە کە مەرجی بوخاری هاوشێوەو مەرجی موسلیم نییە لەسیلسیلەی پیاوان و لەبەیەك گەیشتنی سەنەد.
ابن تيمية دەڵێ: (وَالْمَقْصُودُ هُنَا: التَّمْثِيلُ بِالْحَدِيثِ الَّذِي يُرْوَى فِي الصَّحِيحِ وَيُنَازِعُ فِيهِ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ وَأَنَّهُ قَدْ يَكُونُ الرَّاجِحُ تَارَةً وَتَارَةً الْمَرْجُوحُ وَمِثْلُ هَذَا مِنْ مَوَارِدِ الِاجْتِهَادِ فِي تَصْحِيحِ الْحَدِيثِ كَمَوَارِدِ الِاجْتِهَادِ فِي فِي الْأَحْكَامِ). ((مجموع الفتاوى(٢٢/١٨)). واتا: مەبەست لێرە ئەو فەرموودەی بەصیحیح دەگێڕدرێتەوە، وە بەشێك لەزانایان تێیدا ناکۆك دەبن لە صححەت و دروستی، لەوانەیە جار وایە وتەی ئەوانەی بەلاوازی دەزانن دروست و ڕاجح بێت، وەجار وایە ئەوانەی بەصەحیحی دەزانن دروست بێت، نمونەی ئەوە جێگای ئیجتیهادو تێکۆشانە، لە تەصحیحکردنی فەرمووده، وەك ئیجتیهادکردن لە ئەحکامەکان.

پاشان ابن تیمیة دەڵێ ( وَبَعْضُ مَا يُصَحِّحُهُ التِّرْمِذِيُّ يُنَازِعُهُ غَيْرُهُ فِيهِ كَمَا قَدْ يُنَازِعُونَهُ فِي بَعْضِ مَا يُضَعِّفُهُ وَيُحَسِّنُهُ فَقَدْ يُضَعِّفُ حَدِيثًا وَيُصَحِّحُهُ الْبُخَارِيُّ)). ((مجموع الفتاوى(١٨/٢٤)). واتا: بەشێك لەو فەرموودانەی ترمذی بەصەحیحی دادەنێت، هەندێك لەزانایان بەضەعیفی دادەنێن، هەروەکو چۆن بەپێچەوانەی ترمذی دەکەن لەبەشێك لەو فەرموودانەی بەضەعیفی دادەنێت یان بەحەسەنی دادەنێت، لەوانەیە ترمذی فەرموودە یەك بەلاواز دانێت کەچی ئیمامی بوخاری بەصەحیحی دانێت.

گوتم: مادام تەصحیحکردن و تەضعیفکردنی فەرموودە بابەتێکی ئیجتیهادیە، ئەوە هەیە دەیپێکێ و هەشە نایپێکێ، ئەوەش شتێکی ڕوونە لەلای هەموو عاقڵێك کە زۆرێك لەزانایان لەهەندێك مەسەلە نەیان پێکاوە لەبەرامبەردا زانای تر ڕەئی و بۆچوونی تری هەیە و پێکایتی پاشان گە ڕانەوە بۆ متقدمین ئەوپەڕی جێگای متمانەیەو زۆر کەمە لەو تەصحیح و تەضعیفانەی کە کردوویانە نەیان پێکابێ بەڵکو ئەوان ئەهلی ئەو کارە بوون و لەسەر حەقن، ئەوەش مانای ئەوە نییە لەشکۆی متأخرین کەم بکەینەوە.

ئایە صەحابەی تر تەفسیری بۆ ئەم ئایەتە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ کردووە ؟

لەوەڵامدا بەڵێ صەحابەی تر تەفسیری بۆ ئەم ئایەتە کردووە لەوانە: صەحابەی بەڕێز ابن مەسعود لە تەفسیری ئەم ئایەتەی کردووە، هەروەها ئەمیری ئیماندارن عومەری کوڕی الخطاب و عەلی کوڕی أبو طالب هەروەها ابن عباس.

تەفسیری ابن مەسعود:

ڕیوایەتی یەکەم: (حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: ثنا هُشَيْمٌ، قَالَ : أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْمَلِك بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ ، عَنْ عَلْقَمَةَ ، وَمَسْرُوق أَنَّهُمَا سَأَلا ابْنَ مَسْعُود عَنِ الرِّشْوَةَ ، فَقَالَ: منَ السُّحْت. قَالَ: فَقَالا أَفي الْحُكْم ؟ قَال: ذَاكَ الْكُفْرُ . ثُمَّ تَلا هَذه الآيَةَ : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (تفسير الطبري: (١٢٠٦١)). واتا: یعقوب بن ابراهیم بۆی باسکردین فەرمووی: هشیم بۆی باسکردین، عبدالملك بن أبي سلمان پێمانی گوت، لە سلمة بن کوهیلەوە لە عقلمە و مسروقەوە، پسیاریان کردووە لە ابن مسعود دەربارەی سوو، فەرموویەتی: بریتیە لە سحت،(حرام) وتیان ئەی لە حوکمدا؟، فەرمووی: ئەویان کوفرە، دوای ئەو ئایەتەی خوێندەوە: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللّٰە تعالی دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن.

تێبینی: زانایان دەربارەی السحت چەند ڕایان هەیە، هەیە دەڵێ: سوحت بەمانای هەموو حەرامەکان دێت، واتا: هەموو شتە حەرامەکان دەگرێتەوە؛ هەیە دەڵێ: سوحت بەمانای ڕیشوە دەێت، هەروەکو چۆن ئەوە لەصەحابەکان هاتووە لەوانە: ابن مسعود و ابن عباس و عمر بن الخطاب و وەلەتابیعیەکان: حسن البصري، وسعيد بن جبير ، وإبراهيم النخعي، والسدي ومُجاهِدٌ وقَتادَةُ والضَّحّاكُ. هەموو ئەوانە دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتە و وشەی سوحت دەڵێن: بەمانای ڕیشوە دێت.

لەوانە سەلەف چەند شتێکیان بەڕیشوە زانیوەو فەرقیان پێکردووە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەوا ڕیشوە جۆری هەیەو بەشێکی لە بەشێکی تری توندترە:

(حَدَّثَنَا أَبِي ، ثَنا الْحَكَمُ بْنُ مُوسَى، ثَنَا الْهَيْثَمُ بْنُ حُمَيْدٍ ، ثَنَا الْوَضِينُ بْنُ عطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ ، يَقُولُ: لِلسُّحْتِ خِصَالٌ سِتٌّ: الرِّشْوَةُ فِي الْحُكْمِ، وَثمَنُ الْكَلْبِ، وَثمنُ الْمَيْتَةِ، وَثمنُ الْخَمْرِ، وَكَسْبُ الْبغِيِّ، وَعَسْبُ الْفَحْلِ) ((تفسير ابن أبي حاتم(٦٣٨٥)). واتا: عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ دەڵێ: سوحت شەش جۆری هەیە: ڕیشوە لەحوکمدا، پارەی فرۆشتنی سەگ، پارە ی فرۆشتنی مردارەوە بوو، پارەی فرۆشتنی عارەق، بەدەست هێنانێك بەزۆر داری، کرێی پەڕینی ئاژەڵ.

هەروەها لەسەلەفەوە دەربارەی ڕیشوە لەحوکم جێگیر بووە:

(عَنْ مُجَاهِد، قَوْلَهُ: أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ الرِّشْوَةُ فِي الْحُكْمِ فَهُمْ يَهُودُ. وَرُوِيَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَالْحَسَنِ، وَإِبْرَاهِيمَ، وَعِكْرِمَةَ أَنَّهُمْ قَالُوا: الرِّشْوَةُ فِي الْحُكْمِ)). (تفسير ابن أبي حاتم(٦٣٨٧). واتا: لە مُجَاهِدەوە گوتویەتی: دەربارەی ئەو ئایەتە: أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ دەڵێ: ڕیشوە لەحوکمدا ئەوانە یەهوودن، وە ئەوە لە سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَالْحَسَنِ ، وَإِبْرَاهِيمَ ، وَعِكْرِمَةَ وە گێڕدراوەتەوە گوتویانە: ڕیشوە یە لەحوکمدا.

(قَالَ الْحَسَنُ: كَانَ الْحَاكِمُ مِنْهُمْ إِذَا أَتَاهُ أَحَدٌ بِرُشْوَةٍ جَعَلَهَا فِي كُمِّهِ فَيُرِيهَا إِيَّاهُ وَيَتَكَلَّمُ بِحَاجَتِهِ فَيَسْمَعُ مِنْهُ وَلَا يَنْظُرُ إِلَى خَصْمِهِ، فَيَسْمَعُ الْكَذِبَ وَيَأْكُلُ الرُّشْوَةَ).(تفسير البغوي (٣ج/ص:٥٩) واتا: حەسەنی بەصرى دەڵێ: حاكمى یەهوودیەکان ئەگەر یەکێك هاتبا بۆلای و ڕیشوەی بۆ هێنابا ئەوە ئەوە لایەنگری ئەوی دەگرت و گوێی بۆ دەگرت و دەربارەی پێویستیەکەی قسەی دەکرد وە سەیری دوژمنەکەی نەدەکرد، جا گوێ بیستی درۆ دەبوو و ڕیشوەی دەخوارد.

ڕیوایەتی دووەم: (حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ ، حَدَّثَنَا فِطْرُ بْنُ خَلِيفَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ، عَنْ مَسْرُوقٍ ، قَالَ : كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ : مَا السُّحْتُ ؟ قَالَ : " الرِّشَا " ، فَقَالَ : فِي الْحُكْمِ ؟ قَالَ : " ذَاكَ الْكُفْرُ ثُمَّ قَرَأَ : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (مسند أبو يعلى: (٥٢٦٦). واتا: مَسْرُوق دەڵێ: دانیشتبووم لای عبداللَّەی کوڕی مسعود پیاوێك پێی گوت: ئایا سوو چییە؟ فەرمووی: بەرتیلە، گوتی ئەی لە حوکمدا؟، فەرمووی: ئەویان کوفرە، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن).

ڕیوایەتی سێیەم: (حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ الصَّائِغُ الْمَكِّيُّ ، ثنا سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، ثنا حَمَّادُ بْنُ يَحْيَى الأَبَحُّ ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ ، عَنْ أَبِي الأَحْوَصِ ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: " الرِّشْوَةُ فِي الْحُكْمِ كُفْرٌ، وَهِيَ بَيْنَ النَّاسِ سُحْتٌ). إسناده حسن (صحيح الإسناد رجاله ثقات)قال الهيثمي في مجمع الزوائد (٤/ ١٩٩)رجاله ثقات. واتا: لە أبي الأحوصەوە لە ابن مسعودەوە فەرموویەتی: بەرتیل لە حوکمدا کوفرە، وە لەنێوان خەڵکیدا بریتیە لە سوو و تاوان.

(ورواته ثقات غير حَمَّاد بْن يَحْيَى الأَبَحّ، فمنهم من وثقه ، ومنهم من نسب إليه أنه يهم أحيانا. قال الذهبي: حماد بن يحيى الأبحّ البصري. ثقة، قال أبو داود: يخطئ كما يخطئ الناس " انتهى من"الكاشف" (١ / ٣٥٠)) وقال في "المغني" (١ / ١٩١)): حماد بن يحيى الأبح. ثقة له أوهام وغرائب، وقد لُيِّن، قال ابن مهدي: يهم في الشيء بعد الشيء " انتهى. ولخص حاله الحافظ ابن حجر بقوله: صدوق يخطىء" انتهى من"تقريب التهذيب" (ص ١٧٩)وقال البوصيري رحمه الله تعالى: ورواه الطبراني موقوفا بإسناد صحيح " انتهى من "إتحاف الخيرة" (٥ / ٣٩٤)).

گوتم: ئەو ڕیوایەتانە ڕونن کە بەرتیل تاوانەو حەرامە ئینسان پێی لەدین ناچێتە دەرەوە، بەڵام ئەگەر لەحوکمدا کاری پێ بکرێت ئەوە کوفرە هەروەکو چۆن صەحابەی بەڕێز ابن مەسعود ڕوونی کردەوە، جا ئەوەی ابن مەسعود جیاوازیەکی ڕوونی تێدایە دەربارەی ئەو ڕیشوەی لەنێوان هەموو خەڵکی هەیە، جا ئەوەی ابن مەسعود تایبەتە بە حاکم و قازی ، ئەوەی یەکەم حەرامە، ئەوەی دووەمیش کوفرە، جا گومانی تێدا نییە کە مەبەست لێی کوفری گەورەیە، لەبەر ئەوەی ابن مسعود بەرەهایی فەرمووی کوفرە بەبێ هیچ تەقیید و بەستنەوەیەك کوفریش ئەگەر بەرەهایی هات ئەوە بەمانای کوفری گەورە دێت هەروەکو مەعلومە، هەروەها ڕەدێکیشی تێدایە بۆ ئەوانەی کەوا دەڵێن خەواریج ئیستدلال بەو ئایەتە دەکەن ! ئەوە ڕاستەخۆ تانە دانە لە ابن مەسعود ، ئەگەرچی پێشیان وابێ کوفری بچووکە چونکە ئەو ئیستدلالی کرد بەو ئایەتە، وەپێشی کوفری دەرخەرە.

ڕیوایەتی چوارەم: (وأَخْرَجَ عَبْدُ الرَّزّاق، وسَعِيدُ بْنُ مَنصُور، وابْنُ جَرير، وابْنُ المُنْذِر، وأَبُو الشَّيْخ، والبَيْهَقيُّ في (سُنَنِه)، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ سُئِلَ عَن السُّحْت: أَهُوَ الرِّشْوَةُ في الحُكْمِ؟ قالَ: لا، ﴿ومَن لَمْ يَحْكم بما أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الكافِرُونَ﴾ (المائدة: ٤٤) و ﴿الظّالِمُونَ﴾ (المائدة: ٤٥ و﴿الفاسِقُونَ﴾ (المائدة: ٤٧) ولَكِنَّ السُّحْتَ أَنْ يَسْتَعِينُكَ رَجُلٌ عَلى مَظْلَمَةٍ فَيُهْدِيَ لَكَ فَتَقْبَلَهُ، فَذَلِكَ السُّحْتُ) (تفسير الطبري)٦/٢٤٠ (الدر المنثور" ((٣ / ٨٠)).

واتا: ابن مەسعود پرسیاری لێکرا دەربارەی حەرام ، ئایە سوحت ڕیشوەیە لەحوکمدا ؟ گوتی: نا، ئەو ئایەتەی گوت: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللَّه تعالى دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن. وزاڵمن و فاسقن، بەڵام ڕیشوە ئەوەیە پیاوێك یارمەتیت بدات لەسەر زوڵمێك هەدیەکت بۆ بێنێ جا تۆش قەبوڵی بکەی، ئەوە ڕیشوەیە.

جا سەرنج بدە ڕەحمەتی اللَّه بڕژێ بەسەر دڵ و دەروونت ابن مەسعود زۆر بەڕوونی گوتی: لە حوکمدا کوفرەو ئەو ئایەتەشی کردە بەڵگە، وە هیچ قەرینەیەکیشی نەوت کە ڕیشوە لەحوکمدا کوفری بچووك بێت بەڵکو ڕاستەوخۆ ئیستشهادی بەو ئایەتە کرد، دواتریش ڕوونی کردەوە کە ڕیشوە لەنێو خەڵکی بۆ بەڕێوە بردنی کاروباریان حەرامە.

ڕیوایەتی پێنجەم: (قالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: الرَّشْوَةُ في كُلِّ شَيْءٍ. فَمَن شَفَعَ شَفاعَةً لِيَرُدَّ بها حَقًّا أوْ يَدْفَعَ بها ظُلْمًا. فَأهْدِيَ بها إلَيْه، فَقَبِلَ، فَهو السُّحْتُ. فَقِيلَ لَهُ: يا أبا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! ما كُنّا نَرى ذَلِكَ إلّا الأخْذَ عَلى الحُكْمِ؟ فَقالَ: الأخْذُ عَلى الحُكْمِ كُفْرٌ! قالَ اللَّهُ تَعالى: ﴿ومَن لَمْ يَحْكم بِما أنْـزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الكافِرُونَ﴾ (المائدة: ٤٤). (محاسن التأويل للقاسمي (ج٦/ ص:١٩٩٣). واتا: ابن مەسعود دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: ڕیشوە لەهەموو شتێك، هەرکەسێك شەفاعەتێك بۆ یەکێك بکات بۆ ئەوەی حەقەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، یانیش زوڵمێکی لەسەر لا ببات هەدییەك بدات بەکەسەکە ئەویش قەبوڵی بکات، ئەوە حەرامەو ڕیشوەیە، پێی گوترا ئەی باوکی عبدالرحمان، ئێمە ئەوە ناڵێین بەڵکو دەربارەی حوکمکردن دەڵێین ؟ ابن مهسعود گوتی: وەرگرتنی لەسەر حوکمکردن کوفرە. اللَّه تعالی دەفەرموویێت: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن.

جا ئەوە وتەو تەفسیری ابن مەسعود بوو بۆ ئایەتی: ﴿ومَن لَمْ يَحْكم بِما أنْـزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الكافِرُونَ﴾ (المائدة: ٤٤). ابن مەسعود یەکێك بووە لەصەحابە هەر بەتواناکان لەتێگەیشتن لەئایەتەکانی اللَّه هەروەکو لەصەحیحی بوخاری هاتووە ابن مەسعود دەڵێ: (وَالَّذِي لا إلَهَ غَيْرُهُ ما مِن كِتَابِ اللهِ سُورَةٌ إلَّا أنَا أعْلَمُ حَيْثُ نَزَلَتْ، وَما مِن آيَةٍ إلَّا أنَا أعْلَمُ فِيما أُنْزِلَتْ، ولو أعْلَمُ أحَدًا هو أعْلَمُ بكِتَابِ اللهِ مِنِّي، تَبْلُغُهُ الإبِلُ، لَرَكِبْتُ إلَيْهِ)البخاري (٥٠٠٢).

واتا: سوێند بەو اللَّهیەی کە هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە جگە لەو، هیچ

سورەتێك نییە لەقورئاندا دابەزیبێت ئیلا دەزانم لەکوێ دابەزیوە، وە هیچ ئایەتێك دانەبەزیوە لەقورئاندا ئیلا دەزانم بۆچی دابەزیوە، ئەگەر بزانم کەسێك هەبێت لەمن شارەزاتر بێت لەقورئان، ئەگەر حوشتر بگاتە ئەو شوێنە بۆی دەچم. جا سەرنج بدە خوێنەری بەڕێز ئەو صەحابە بەڕێزە سوێند دەخوات بە شارەزابوونی لەسورەتەکانی قورئان بەڵکو هەر ئەوەش نا بەڵکو ئایەت بەئایەت شارەزایەو دەزانێ بۆچی و لەکوێش دابەزیوە.

هەروەها موفەسیری وا هەبووە دەڵێ ئەگەر قیرائەی ابن مەسعودم خوێندبا پێویستم بەوە نەبوو پرسیار لە ابن عباس بکەم لەزۆرێك لەو پرسیارانەی کە دەربارەی تەفسیری قورئان لێم کردووە !! لەوانە ئیمامی موجاهید دەڵێ: (لَوْ كُنْتُ قَرَأْتُ قِرَاءَةَ ابْنِ مَسْعُودٍ لَمْ أَحْتَجْ أَنْ أَسْأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الْقُرْآنِ مِمَّا سَأَلْتُ). (جامع الترمذي: ٢٩٥٢) واتا: گەر قیرائەی ابن مسعودم خوێندبوایە ئەوا پێویستم بەوە نەئەبوو پرسیار لە ابن عباس بکەم لە زۆرێک لەو پرسیارانەی دەربارەی تەفسیری قورئان لێم کردووە. چونکە قیرائەی ابن مسعود تایبەتمەندییەکی هەیە هەندێک جار ئەو تەفسیرەی کە ئایەتەکە هەیەتی خودی قیرائەکەی تەفسیرەکەت پێ ئەدات و بۆت ڕوون دەکاتەوە.

## تەفسیری ابن عباس

(حدثنا الحسن بن أبي الربيع الجرجاني قال: أخبرنا عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه قال : سُئل ابن عباس عن قوله : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾؟ قالَ: كَفَى بِهِ كُفْرُهُ). (أخرج وكيع في أخبار القضاة ٤١/١). واتا: پرسیار کرا لە ابن عباس لە تەفسیری ئایەتی: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) فەرمووی: ئەوەندەی بەسە کە بە کافر ناوی هاتوە و اللّه کافری کردوە.

گوتم: ئەوە یەکێکە لەڕیوایەتە هەرە ڕوونەکان کە ابن عباس تەفسیری ئەو ئایەتە دەکات و بەکوفری دەرخەر لە قەڵەمی دەدات، ئاخۆ دەبێت ئەو ڕیوایەتانە بەبەرچاوی ئەوانەی کە دەڵێن کوفر دونە کوفرە کەوتبێ؟ کەهیچ بەستنەوەیەکی تێدا نییەو ڕاستەوخۆ بەکوفر لەقەڵەمیان دەدات !

هەروەها ڕیوایەتێك لە ئیمامی عمری کوری الخطابەوە گێڕدراوەتەوە کەلاوازیەکی تێدایە: (حَدَّثَنَا أَبُو يَزِيدَ، ثنا أَسَدُ بْنُ مُوسَى، ثنا يَزِيدُ بْنُ عَطَاءٍ، عَنْ أَبَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ قالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: أرَأَيْتَ الرِّشْوَةَ في الحُكْمِ، أَمِنَ السُّحْتِ هِيَ؟ قَالَ: لا، ولَكِنْ كُفْرٌ، إنَّمَا السُّحْتُ أنْ يَكُونَ لِلرَّجُلِ عِنْدَ السُّلْطَانِ جاهٌ ومَنزِلَةٌ، ويَكُونَ لِلآخَرِ إلى السُّلْطَانِ حاجَةٌ، فَلا يَقْضِي حاجَتَهُ حَتّى يُهْدِيَ إِلَيْهِ هَدِيَّةً) (أخرجه الطبراني في "الدعاء" (٢١٠٦)) فيه : أبان بن أبي عياش، قال عنه الحافظ في التقريب: متروك (أخرجه ابن المنذر في "الاوسط" (٦٥٤٩/ط:دار الفلاح)). واتا: لە مەسروقەوە دەڵێ: گوتم بە ئیمامی عومەر ئایە ئەگەر زانیت بەرتیل ڕیشوە لەحوکمدا لە حەرامەکانە؟ فەرمووی: نا بەڵکو کوفرە، بەڵکو ڕیشوەی حەرام ئەوەیە پیاوێك لەلای دەسەڵاتدار دەستی هەبێ و شوێنی هەبێ وە کەسی تر لەلای دەسەڵاتدارەکە پێویستیەکی هەبێت، ئەو پیاوە پێویستیەکەی جێبەجێ نەکات، هەتا هەدیەکی بۆ نەهێنێ.

گوتم: ئەوە یەکێکە لەبەڵگە ڕوونەکان کە ڕیشوە لەحوکم کردن کوفری گەورەیە، بەڵام لەغەیری حوکم کردن حەرامەو تاوانە هەروەکو چۆن ڕوونی کردەوە کە ئەگەر کەسێك پێویستیەکی هەبوو لەشوێنێك لەڕێی یەکێك کارەکەی لەو شوێنە جێبەجێ بکات ئەو کەسەش پلەی هەبێ لەو شوێنە جا بڵێ تا هەدیەکم بۆ نەهێنی ئەو کارەت بۆ ناکەم جا کەسەکەش هەدیەکی بۆ بەرێت جا ئەوە لێرەدا حەرامەو تاوانەو دروست نییە، ئەمما ڕیشوە

لەحوکمدا ئەگەر حوکمی پێ بکرێت گومان نییە لەوەی کە کوفرە، چونکە گۆڕینی شەرعی اللَّه تعالی یە.

هەروەها لەڕیوایەتی تر هاتووە لەئیمامی عومەرەوە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ڕیشوە لەحوکم ئەوەشی کەلەنێوان خەڵکی دەخورێ: (وقالَ الأعْمَشُ عَنْ خَيْثَمَةَ عَنْ عُمَرَ قالَ: بابانِ منَ السُّحْتِ يَأْكُلُهما النّاسُ: الرُّشا ومَهْرُ الزّانِيَةِ) (أحكام القرآن للجصاص(٨٥/ ٤). واتا: ئەعمەش لە خەیثەمەوە ئەویش لەئیمامی عومەرەوە گوتویەتی: دوو شت هەن لەحەرامەکانن خەڵکی دەیخۆن: ئەویش ڕیشوەو مارەیی زیناکارە.

جا سەرنج بدە ئەوە زیاتر تێبینیەکەمان ڕوندەکاتەوە کە ئیمامی عومەر گوتی لەنێو خەڵکی نەك لەحوکمدا، چونکە وە لەپێشدا ئاماژەمان پێدا لەحوکمدا بە کوفر ناوی بردراوە لەهەموو ئەثەرەکان.

تێبینی: ئەو ئەثەرە پچڕانی تێدایە خَيْثَمَةَ گوێی لە ئیمامی عومەر نەبووە بەڵام لەبەر ئەوە استشهادم پێکرد چونکە لەڕووی ماناوە تەواوە بەڵام لە ڕووی سەنەدەوە پچڕانی تێدایە.

(عَنْ مَسْرُوق قالَ: إنَّ القاضِيَ إذا أخَذَ الهَدِيَّةَ فَقَدْ أكَلَ السُّحْتَ، وإذا أكَلَ الرِّشْوَةَ بَلَغَتْ بِهِ الكُفْرَ) (أحكام القرآن للجصاص(٨٥/ ٤). واتا: لە مەسورقەوە دەڵێ: ئەگەر قازی هەدیەی وەرگرت ئەوە حەرامی خواردووە، وە ئەگەر ڕیشوەی خوارد ئەوە کوفری کردووە.

پێشەوا علي بن طالب:

(وأخْرَجَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ عَلِيٍّ بْنِ أبي طالِبٍ، أنَّهُ سُئِلَ عَنِ السُّحْتِ فَقالَ: الرِّشا، فَقِيلَ لَهُ: في الحُكْمِ؟ قالَ: ذاكَ الكُفْرُ). (الدر المنثور السيوطي(٣/٨١). تفسير روح المعاني للألوسي، مجلد ٣، ((ج ٦ / ص: ١٤٠ )). واتا: ئیمامی عەلی پرسیاری لێکرا دەربارە ی سوحت، گوتی: ڕیشوەیە، پێی گوترا: ئەی ڕیشوە لەحوکمدا ؟ فەرمووی: ئەوە کوفرە.

تێبینی: ئەو ئەثەرە لەبەشێک موسنەدەکەی عبد بن حمید هاتووە ئەو موسنەدە بەشێکی مەفقودەو دیار نییە هەربۆیە سەنەدەکەشی ڕوون نییە.

جا لێرەدا پرسیار ئەوەیە بۆچی وتەی صەحابەیەك وەردەگرن وە هی ئەوانی تر پشت گوێ دەخەن؟ لەکاتێکدا ئەوەی وا گومان دەبەن ابن عباس وای وتووە وانییەو بەڵکو بەپێچەوانەوە بەکوفری گەورەی زانیوە هەروەکو لەپێشوو لاوازی ئەثەرکەمان ڕونکردەوەو ئەوەشی کە جێگیر بووە دیاریمان کرد کە مەبەستی پێی کوفری گەورەیە. واللَّه المستعان.

چەند جوانە وتەکەی ابن رجب کە دەڵێ: (الواجب على المسلم أن يحب ظهور الحق ومعرفة المسلمين له، سواءٌ كان ذلك في موافقته أو مخالفته، وهذا من النصيحة لله ولكتابه ورسوله ودِينه، وأئمة المسلمين وعامتهم، وذلك هو الدين، كما أخبر النبي ﷺ). (الفرق بين النصيحة والتعيير) ٣٢/ ٣٣).

واتا:واجبە لەسەر موسوڵمانی کە دەرکەوتنی حەقی خۆشبوێت وە زانینی خەڵکی بۆ ئەو حەقەشی خۆشبوێ، جا چ ئەو حەقە لەبەرژەوندی و موافەقەکەی خۆی بێت یاخود لەپێچەوانەی خۆی تێدا بێت، وە ئەوەش ئامۆژگاریە بۆ اللَّه تعالى پاشان پەرتوکەکەی و پێغەمبەرکەی و دینەکەی، بۆ گەورە و موسوڵمانان بەگشتی.

ئایه ئەگەر ڕاجیایی لەنێوان صەحابە هەبوو دەربارەی تەفسیری ئایەتێك چی بکەین ؟

ئیمامی شافعی پرسیارێکی لێدەکرێت دەربارەی ڕاجیایی وتەی صەحابە: (أرأيت أقاويل أصحاب رسول اللَّه ﷺ إذا تفرقوا فيها؟ فقلت نصير منها إلى ما وافق الكتاب أو السنة أو الاجماع) (الرساله(١/ ٥٩٧)) واتا: ئەگەر ببینیت و زانیت وتەکانی صەحابەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاجیایی تێدا بوو؟ ئەوە دەڵێم: بۆ ئەوە دەچین کە موافقی قورئانە یان سوننەت یان کۆدەنگ.

کۆدەنگی زانایان هەیە کە وتەی صەحابەیەك بەسەر وتەی صەحابەیەکی تر نابێتە بەڵگە چجای ئەوەی کۆمەڵێك لەصەحابە پێچەوانەی ئەو قسە بکەن ! یاخود ئەو وتە پێچەوانەی قورئان بێت !:

ئیجماع هەیە کە دەڵێ: (وَأَجْمَعُوا أَنَّ قَوْلَ الصَّحَابِيِّ لَا يَكُونُ حُجَّةً عَلَى الصَّحَابِي) (الاجتهاد (ص:١٢١). واتا: زانایان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە وتە ی صەحابەیەك بەسەر صەحابەیەکی تر نابێتە حوجەو بەڵگە.

ابن تيمية دەڵێ: (وَأَمَّا أَقْوَالُ الصَّحَابَة؛ فَإِنْ انْتَشَرَتْ وَلَمْ تُنْكَرْ فِي زَمَانِهِمْ فَهِيَ حُجَّةٌ عِنْدَ جَمَاهِيرِ الْعُلَمَاءِ وَإِنْ تَنَازَعُوا رُدَّ مَا تَنَازَعُوا فِيهِ إلَى اللَّهِ وَالرَّسُول. وَلَمْ يَكُنْ قَوْلُ بَعْضِهِمْ حُجَّةً مَعَ مُخَالَفَة بَعْضِهِمْ لَهُ بِاتِّفَاقِ الْعُلَمَاءِ وَإِنْ قَالَ بَعْضُهُمْ قَوْلًا وَلَمْ يَقُلْ بَعْضُهُمْ بِخِلَافِه وَلَمْ يَنْتَشِرْ؛ فَهَذَا فِيهِ نِزَاعٌ وَجُمْهُورُ الْعُلَمَاءِ يَحْتَجُّونَ بِه) (مجموع الفتاوى (٢٠ /١٤)). واتا: بەڵام وتەی صەحابەکان ئەگەر بڵاو بوویەوەو لەکاتی ئەواندا نکوڵی لێ نەکرا، ئەوە بەڵگەیەو حوججەیە لەلای جمهوری زانایان، بەڵام ئەگەر ناکۆکی کەوتبووە نێوانیان ئەوە ئەو شتەی لێی ناکۆکن دەگەڕێندرێتەوە بۆ لای اللَّه تعالی کە قورئانە وە رسولەکەی کە سوونەتەکەیەتی، وە وتەی صەحابەیەك بەسەر ئەوانی تر کە پێچەوانەی کردوون نابێتە بەڵگە بەکۆدەنگی زانایان، ئەگەر بەشێك لەصەحابەکان وتەیەکیان گوت و بەشێکیان ئەو وتەیەیان بەپێچەوانەیەوە نەوتبوو و بڵاویش نەبووبوویەوە ئەو وتە، ئەوە ڕاجیایی تێدایە لەناو زانایان، جمهوری زانایان دەیکەن بەبەڵگە.

الآمدي دەڵێ: (اتَّفَقَ الْكُلُّ عَلَى أَنَّ مَذْهَبَ الصَّحَابِيِّ فِي مَسَائِلِ الِاجْتِهَادِ لَا يَكُونُ حُجَّةً عَلَى غَيْرِهِ مِنَ الصَّحَابَةِ الْمُجْتَهِدِينَ إِمَامًا كَانَ أَوْ حَاكِمًا أَوْ مُفْتِيًا). (كتاب الإحكام في أصول الأحكام للآمدي (١٤٩/٤). واتا: هەموون کۆکن لەسەر ئەوەی مەزهەبی صەحابەیەك لە بابەتی تێکۆشاندا نابێتە بەڵگە لەسەر صەحابەی تر لەوانەی تێکۆشانیان کردووە، جا ئەو صەحابەیە ئیمام بێت یاخود حاکم بێ یانیش موفتی بێت.

الشنقيطي دەڵێ : (قول الصحابي الذي ليس له حكم الرفع ليس بحجة على مجتهد آخر من الصحابة إجماعاً). ( مذكرة أصول الفقه " ( ص ٢٥٦ ). واتا: وتەی صەحابەیەك کە حوکمی ڕەفعی نییە حوججەو بەڵگە نییە لەسەر صەحابەیەکی موجتەهیدی تر بە کۆدەنگی زانایان.

جا وادامننا ئەو ئەثەرە لە ابن عباسەوە جێگیر بووە، چۆن وتەی صەحابە یەك وەردەگرن و ئەوەی تر ڕەتدەکەنەوە؟؟!! یاخود تەئویلی بۆ دەکەن، والله المستعان.

پاشان ئەوانەی ئەو ئەثەرەی ابن عباس دەکەنە بەڵگە بۆخۆیان و هەر کەسێك پێچەوانەیان بکات بەخەواریجی دەزانن ! دەڵێن ئەوەتا ئیمامی سەمعانی وتویەتی: (وَاعْلَم أَن الْخَوَارِج يستدلون بِهَذِهِ الْآيَة، وَيَقُولُونَ: من لم يحكم بِمَا أنزل الله فَهُوَ كَافِر. وَأهل السّنة قَالُوا: لَا يكفر بترك الحكم). واتا: بزانە خەواریجەکان بەڵگە دێننەوە بەم ئایەتە ودەڵێن: ئەوەی حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندوە بێباوەڕە، وە ئەهلی سوننە دەڵێن: کافر نابێت بەتەرک کردنی حوکم.

دەربارەی ئەو شوبهەیە دەڵێین: كلمة حق أردوا بها باطلا، وتەیەكی حەقە بەڵام ئەوانە مەبەستیان شتێكی باطڵ و پوچە ! چونكە مەعلومەو ڕوونە لەلای هەموان كە: (خەواریج بەگوناهو تاوان خەڵكیان تەكفیر دەكرد پێیان وابوو كە هەر كەسێك زینا بكات یاخود مەشروب بخوات بێباوەڕە یان هەر گوناهێكی گەورە بكات ئەوان پێیان وابوو بێ باوەڕەو لەدین چۆتە دەرەوە جا ئەو ئایەتەشیان دەكردە بەڵگە بۆخۆیان ! خەواریجەكان پێیان وابوو هەموو كردەوەیەك شەرط و مەرجی ئیمانە، بەجۆرێك جیاوازیان نەدەكرد لەنێوان هەڵوەشێنەرەوە كردەوەییەكان و ئەو تاوانانەی كە كوفر نین، جا خەواریجەكان تاوانیان لەژێر ناوی (حكم بما أنزل اللَّه) دانابوو پێیان وابوو دەچێتە ژێر ئەو ئایەتە، جا ئەلێرەوە توشی شوبهە بووبوون هەموو ئەوانەی كە گوناهێكی گەورەی كردبا ئەوە حوكمی بەوە نەكردووە كە اللَّه دایبەزاندووە ! جا پێویستە تەكفیر بكرێت ! لەبەر بەڕاست دانانی وتەی اللَّه كە دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ جا خەواریج ئەو ئایەتەیان دەكرد بەڵگە بۆ هەموو ئەو كەسانەی كە تاوانیان دەكرد، هەروەها لە كاتی مونازەڕەكەیان لەگەڵ ابن عباس حەقیقەتی مەزهەبەكەیان ڕوون بوویەوە دەربارەی كوفرو ئیمان كە ئەو قەومە خەواریج وای دەبینن هەموو تاوانێك حوكم كردنە بەغەیری ئەوەی كە اللَّه دایبەزاندووە، جا ابن عباس وەڵامی دانەوە بەوەی ئەوەی ئەوان بۆی دەچن كفر دون كفره كوفرێكە لەخوار كوفرە، دوای ئەوەی قورئانیان بەرزكردەوە

گوتیان پیاوانتان کردووە بە حاکم ؟ وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو قەزیە بەربڵاوە، بۆ پاراستنی خوێنی موسوڵمانان لەخیلالی ئەو حەرب و خیلافەی لەنێوان ئیمامی عەلی و موعاویە ڕویدا، کە دوو کەسیان کردبوو بەحەکەم لەنێوانیانی خۆیاندا ئەویش أبو موسای ئەشعەری کە لایەنگری ئیمامی عەلی بوو وەهەروەها عەمری کوڕی عاص کە لایەنگری موعاویە بوو، جا ئەو وتەی ابن عباس ئەگەر ڕاست بێت ئەوە لەئاکامی وەڵامدانەوەی بووە بۆ خەواریجەکان دەربارەی حوکم کردن بەوەی اللّٰە تعالی دایبەزاندووە،وە ئەو تاوان و مەعصیەتە گەورانەی کە خەواریج خستبویانە ژێر ئەو ئایەتە ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ ئەوا کوفرێك نییە کە لەمیللەتی ئیسلامی دەربکات، بەڵکو ئەوە کفر دون کفرە، جا ئەو تەفسیرە ئاراستەی دەستەیەکی دیاری کراو کراوە، تەفسیری ئەو ئایەتە ناکات، (ليسَ الْكُفْرُ الْذي يَذْهَبُونَ إِلَيْه). واتا: ئەو کوفرە نییە کە بۆی دەچن. (كُفْرٌ لَا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّة). واتا: ئەمە کوفرێکە لە بازنەی ئیسلام دەری ناکات (بحث مقولة كفر دون كفر والرد على مرجئة العصر(ص: ٢٣- ٢٤)).

بەڵگەمان بۆ ئەم قسە کە خەواریج پێی وابوو هەرکەسێك تاوان بکات ئەوە حوکمی بەوە نەکردووە کە اللّٰە دایبەزاندووە بۆیە پێچەوانەی ئەهلی سوننە یان دەکرد جا بەڵگەمان بۆ ئەوە ئەگەر ئەثەرەکەش وەرگرین کە ئیمامی طاوس دەڵێ کوفرێکی دەرخەر نییە لەئیسلام مەبەست پێی ئەوەیە:

شیخ سلیمان بن عبدالله بن عبدالوهاب دەفەرمووێت: (وقال وكيع عن سعيد المكي عن طاووس؛ قال: ليس الحكم في الفروع بغير ما أنزل الله مع الإقرار بحكمه والمحبة له ينقل عن الملة. وعن طاووس عن ابن عباس؛ قال: ليس بالكفر الذي تذهبون إليه. رواه الحاكم وقال على شرط الشيخين ولم يخرجاه. وقد جنح الخوارج إلى العموم لظاهر الآية، وقالوا: إنها نص في أن كل من حكم بغير ما أنزل الله؛ فهو كافر، وكل من أذنب فقد حكم بغير ما أنزل الله؛ فوجب أن يكون كافراً. وقد انعقد إجماع أهل السنة والجماعة على خلافهم، ونحن لم نكفر إلا من لم يحكم بما أنزل الله من التوحيد؛ بل حكم بضده، وفعل الشرك ووالى أهله وظاهرهم على الموحدين؛ أو من لم يقم أركان الدين عناداً وبغياً بعد أن دعوناه؛ فامتنع وأصر أو من جحد ما جاء به الرسول ﷺ من سائر الأمور الدينية والمغيبات الإيمانية). (التوضيح عن توحيد الخلاق في جواب أهل العراق وتذكرة الأولى الألباب في طريقة الشيخ محمد بن عبدالوهاب: (١٤٠_١٤٢)). واتا: وەكيع فەرموويەتی لە سعيد المكيەوە لە طاووسەوە فەرموويەتی: حوكم بەجگە لەوەی اللّٰه تعالی دای بەزاندووە لەفروعەكاندا كوفرێك نییە لەدینی ببیاتەدەر بەدانپیانان بەحوكمەكەی و خۆشەویستی بۆی، وە لە طاووسەوە وە لە ابن عباس فەرموويەتی: كوفرێك نییە كە بۆی دەچن، وە خەواريج زاهیری گشتی ئایەتەكەیان وەرگرت، وە گوتیان: ئەوە نەصە بۆ هەموو ئەو كەسانەی كە حوكم بە دابەزێنراوەكانی اللّٰه تعالی ناكەن كافرن، وە هەموو كەسێك تاوان بكات حوكمی بەوە نەكردووە كە اللّٰه تعالی دایبەزاندووە، و

واجبە کافر ببێت، وە یەکدەنگی ئەهلی سوننە و جەماعە پێچەوانەی ئەوان دامەزراوە وە ئێمە تەنها ئەو کەسەمان کافر کردووە کە لەتەوحیدا حوکم بەوە ناکات کە اللَّە تعالی دایبەزاندووە و بەڵکو حوکمی بە دژی تەوحید کردووە و شیرکی ئەنجام داوە و دۆستایەتی موشریکانی کردووە و سەریان دەخات بەسەر موسڵمانان یاخود ئەوەی ئەرکانەکانی دین جێبەجێ نەکات بەهۆی عینادەوە و ڕێگری کرد و پێداگر بوو یاخود نکۆڵی لەوە بکات کە رسول اللَّە ﷺ بۆی هاتووە، لەهەموو فەرمانەکانی دین و غەیبیەکانی ئیمان. سەرنج بدە دەربارەی خەواریج و تێگەیشتنیان بۆ ئەم ئایەتە گوتی: هەموو کەسێك تاوان بکات حوکمی بەوە نەکردووە کە اللَّە تعالی دایبەزاندووە. وە ئەوە وتەی سەلەفە کە دەڵێن لەفروعەکان نەك تەواوی حوکم پەك بخات ! وە طاوس ئەو کوفر دونە کوفرەشی ڕوونکردەوە کی چکاتێك ئەو کوفر دون کوفرە دەیگرێتەوە !

## وەڵام دانەوەی شوبهەیەکی تر کە بڵاوی دەکەنەوە ئەویش شوبهەی ئەوەی کە ابن بطة ئەو ئەثەرەی ابن مەسعود دەربارەی ڕیشوە لەژێر ئەو تاوانانە داناوەکە لەدیینی ئیسلامی دەرناکات !

لەوەڵامدا دەڵێین: الحمدللّٰه کە ئەثەرەکەی ابن عباس کەوتی: بە کفر، یان کفی بە کفرە، ڕوونەو پێویست بە تەئویلی هیچ کەسێك ناکات، پاشان ئەثەرکەی ابن مەسعودیش ڕوونە کە بەرتیلی لەحوکم بە کوفر ناو برد، ئە ی ئەوانەی بانگەشەی شوێن کەوتنی صەحابە دەکەن ئایە وتەی صەحابە بەس نییە؟ پاشان ئێمە لەپێشوو ئاماژەمان پێدا کە حوکم کردن بەقورئان پە یوەندی بەعەقیدەوە هەیەو ڕەبتی هەیە بە تەوحیدی ڕبوبیەت و ئولوهیەت و ئەسمائو صیفات ! وە ابن بطة  یەکێکە لەزانا هەرە گەورەکان یەکێکە لەزاهیدو فەقیهەکان ابن بطة حەنبەلی مەزهەب بوو، ڕەحمەتی اللّٰەی لێبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەعصوم نییەو قابیلی هەڵەیە جا ڕەنگە لەسەر دڵی کەسانێك زۆر قورس گران بێ کاتێك دەڵێین مەعصوم نییە ! ئەوەش بەهۆی تەعصوبەوەیە پەنا  بە اللّٰە  دەگرین لە تەعصوبی جاهیلانە، ئایە ابن بطة مەعصومە؟ ئایە ئێمە دەکرێ چەندەها ئایەتی موحکەم بۆ ڕایەکی ابن بطە بەجێ بێلین؟ ئەو هەمووە ئایەتە کە باسی حوکم دەکات کە حوکم کردن پە یوەندی هەیە بە عەقیدەوە بۆ وتەو ڕەئی بەجێ بێلین؟! وەهەروەها  دەبینین ابن بطەش لە نەقدی ئەهلی فەرموودە سەلامەت نییە،

دەربارەی ابن بطة دەڵێن: (قال أبو القاسم الأزهري (٣٥٥هـ ٤٣٥ هـ): ابن بطة ضعيف ضعيف) (ميزان الاعتدال(٣/ ١٥) واتا: أبو القاسم الأزهري دەڵێ: ابن بطة لاوازە لاوازە.

(قال الذهبي: وكان صاحب حديث، ولكنه ضعيف، من قبل حفظه). (ميزان الاعتدال(٣/ ١٥) واتا: خاوەنی فەرموودە بوو بەڵام لەڕووی حیفظەوە لاواز بوو. وەهەروەها دەڵێ (ولابن بطة على فضله غلط، وأوهام) واتا: لەگەڵ ئەو فەزڵەی ابن بطة هەیەتی بەڵام هەڵەی هەیە لەگەڵ وەهم.

(وقال حمزة بن محمد بن طاهر الدقاق : لم يسمع ابن بطة الغريب من بن عزيز، وقال : ادعى سماعه) سير أعلام النبلاء (١٦/ ٥٢٩). واتا: ابن بطه گوێی لە الغريب بن عزيز نەبووە، بانگەشەی ئەوەشی کردووە کە گوێی لێبووە.

(قال الخطيب : وروى ابن بطة كتب ابن قتيبة ، عن ابن أبي مريم الدينوري، عنه ، ولا يعرف ابن أبي مريم) سير أعلام النبلاء (١٦/ ٥٢٩). واتا: خەطیبی بەغدادی دەڵێ: ابن بطة لە کتێبەکانی ابن قوتەیبە دەگێڕێتەوە لە ابن أبي مريم دینەوەریەوە لە ابن قوتەیبەوە، جا ابن بطة ابن أبي مريم یش ناناسێ.

بەهەمان شێوە ذەهەبی دەڵێ: (ومع قلة إتقان ابن بطة في الرواية - فكان إماما في السنة، إماما في الفقه، صاحب أحوال وإجابة دعوة) (ميزان الاعتدال(٣/ ١٥) واتا: لەگەڵ کەمی ئیتقانی ابن بطة لەڕیوایەتکردن، ابن بطه ئیمام بوو لە سوننە، ئیمام بوو لەفیقهـ وە زاهید و دوعا وەرگیراو بوو.

(وكذا غلط ابن بطة في روايات عن حفص بن عمر الأردبيلي، أنبأنا رجاء بن مرجى، فأنكر الدارقطني هذا) سير أعلام النبلاء (١٦/ ٥٢٩). واتا: بەهەمان شێوە ابن بطة هەڵەی کردووە، لەڕیوایەتەکان، لە عن حفص بن عمر الأردبيلي أنبأنا رجاء بن مرجى، جا دارەقوطنی ئینکاری لەو ڕیوایەتە دەکات.

جا ئیجتیهاد و تێکۆشانی مانای ئەوە نییە پێکاییی ڕوونە زۆر زانای لەو گەورەتر هەیە لەچەندین مەسەلە نەیپێکاوە، هەڵەی کردووە، هیچ کەسێك دوای رسول اللَّه ﷺ مەعصوم نییە گومانی تێدا نییە کە هەموو کەسێك هەڵە دەکات بێجگە لە رسول اللَّه ﷺ کەسی تر مەعصوم نییە موعەررەضە بۆ هەڵە، ئەوەی سەیرە لەمەسەلەیەکی ئاوا هەستیارو گەورەدا قەولێکی زەعیف دەکەن بەبەڵگە و کەلامی اللَّه تعالى ڕەتدەکەنەوە! دێن دەیکەنە بە ڵگە لەکاتێکدا سەلەف بەو شتە ڕازی نین و بگرە پێچەوانەی ئەوەن پاشان زوڵمێکی زۆر گەورەیە کە لەصەحابەی بەڕێز ابن عباس دەکرێت بەخستنە پاڵی ئەو وتە بۆلای! واز لەدەیەها نەصی صەڕیح و ڕوونی تر دەهێنن کە

باسی حوکمی اللَّه تعالی دەکات! یان وادامننا ابن بطة مەبەستی لەو شتە لەلایەنی حوکمەکەشە ئایە مەعصومەو هەڵە ناکات؟ بێگومان ئەوەی پێی وابێ هەڵە ناکات ئەوە موخالفی هەموو ئەهلی سووننەی کردووە چونکە ئەهلی سوونە ڕاجیاییان نییە کە هەموو کەسێك بەدەر نییە لەهەڵە کردن جگە لە رسول اللَّه ﷺ (عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: " لَيْسَ أَحَدٌ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَّا يُؤْخَذُ مِنْ قَوْلِهِ وَيُتْرَكُ، إِلَّا النَّبِيَّ ﷺ (ابن عبد البر في الجامع ٩١/٢). واتا: ئیمامی موجاهید دەڵێ: هیچ کەسێك نییە دوای رسول اللَّه ﷺ ئیلا قسەی لێ وەردەگیرێ و لێشی ڕەتدەکرێتەوە، ئیلا رسول اللَّه ﷺ نەبێت.
جا بۆیە هیچ کەسێك مەعصوم نییە لەوەی هەڵە نەکات.

ئیمامی مالیك دەڵێ: (كُلُّ أَحَدٍ يُؤْخَذُ مِنْهُ وَيُرَدُّ عَلَيْهِ إِلاَّ صَاحِبُ هَذَا القَبْرِ: يعني النبيَّ ﷺ) (سير أعلام النبلاء(٩٣/٨)، البداية والنهاية (٣٠٢/١٨). واتا: هەموو کەسێك وتەی لێ وەردەگیرێت و لێشی ڕەتدەکرێتەوە، ئیلا خاوەنی ئەو گۆڕە نەبێ، واتا: رسول اللَّه ﷺ.
ئیمامی شافعی دەڵێ: (أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَنَّ مَنِ اسْتَبَانَ لَهُ سُنَّةٌ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ لَمْ يَحِلَّ لَهُ أَنْ يَدَعَهَا لِقَوْلِ أَحَدٍ) (الفلاني؛ ص:١٨). واتا : موسڵمانان کۆڕان - یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر موسڵمانێك سونەتێك لە سونەتەکانی رسول اللَّه ﷺ لە لا جێگیر بێت و ئاشکرا بوو ، ئەوا بۆی حەڵاڵ نییە لەبەر ووتەی هیچ کەسێك وازی لێبهێنێت.

ئیمامی ئەحمەد لە پرسیارێکدا کە کە ئەبو داود لێی دەکات دەڵێ: (لَا تقلد فِي دينك أحدا من هَؤُلَاءِ مَا جَاءَ عَن النَّبِي ﷺ وَأَصْحَابه فَخذ بِهِ ثمَّ التَّابِعين بعد الرجل فِيهِ مُخَيّر) مسائل الإمام أحمد "رواية أبي داود/ ص: ٢٧٦. واتا: لەدیندا تەقلیدی هیچ کەسێك مەکەوە لەوانە، ئەوەی لە پێغەمبەرو صەحابە هاتووە وەری بگرە، پاشان تابیعین، لەپاشدا پیاو تێیدا موخەییەرە.

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: (لَيْسَ أَحَدٌ إِلَّا وَيُؤْخَذُ مِنْ رَأْيِهِ وَيُتْرَكُ، مَا خَلَا النبي ﷺ) (مسائل أبي داود) (١٧٨٦). واتا: هیچ کەسێك نییە ئیلا ڕەئی لێ وەردەگیرێ و لێشی ڕەتدەکرێتەوە، بیجگە لە رسول اللَّه ﷺ.

ابن تیمیة دەڵێ: (وَقَدْ اتَّفَقَ سَلَفُ الْأُمَّةِ وَأَئِمَّتُهَا عَلَى أَنَّ كُلَّ أَحَدٍ يُؤْخَذُ مِنْ قَوْلِهِ وَيُتْرَكُ إلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ). (مجموع الفتاوى (١١/ ٢٠٨). واتا: هەموو سەلەف لەسەر ئەوە کۆکن کە هەموو کەسێك وتەی لێ وەردەگیرێت و لێشی وەرناگیرێ، ئیلا رسول اللَّه ﷺ نەبێت.

## پاشان ئەگەر وادامانا ئەو وتە هی ابن عباسە ئایە ابن عباس مەعصومە؟

بێگومان هیچ یەکێك ناڵێ مەعصومە مەگەر کەسێك اللّٰه بەصیرەتی لێ سەندبێ و لە ئاست حەق کوێری کردبێ، ابن عباس لەچەندین مەسەلە بە پێچەوانەوە قسەی کردووە، ئەوەش مانای نەقص دانە پاڵ نییە ئاگاداربە چونکە کەسێك تەعن لە صەحابە بدات زندیقە هەروەکو مەعلومەو زانراوە جا صەحابەی بەڕێز ابن عباس لەو شتانە ئیجتیهادی کردووەو بەبێ ئەوەی مەبەستی وابێ خیلافی قورئان و سوننەت بکات لەوانە:

١. ابن عباس وای دەبینی کە موتعە حەڵاڵە: (وَذَكَرَ عَبْدُ الرَّزَّاق عَن ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاس يَرَاهَا حَلاَلاً حَتَّى الْآنَ وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ) (كتاب التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد(ج:١٠/ ص: ١١٣. واتا: ابن جورەیج دەڵێ: عەطا هەواڵی پێدام کە گوێی لە ابن عباس بووە، کە موتعەی پێ حەڵاڵ بووە هەتا ئێستا، وە هەواڵی پێدام کەابن عباس ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: (فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ) واتا: ئەوەندەی کە سوودتان لەو ئافرەتانە بینی بەجیماع کردن مارەییەکەیان بدەنێ.

لە كاتێدا لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە كە: ئیمامی عەلی گێڕاویەتیەوە رسول اللَّه ﷺ نەهی كردووە لە نیكاحی موتعە : (أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ) (البخاري ( (٥١١٥)) مسلم (١٤٠٧)
واتا: رسول اللَّه ﷺ نەهی كرد لە نیكاحی موتعەو سیخە وە لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی لە غەزای خەیبەردا. ئایە دەكرێ ئێمە ئەو رەئیەی ابن عباس وەرگرین كە موخالفی قورئان و سوننەتە ؟!
تێبینی: ابن عباس لەو ڕایە گەڕاوە هەروەكو ئیمامی ترمذی و غەیری ئەویش ئاماژە بەوە دەدەن هەروەكو چۆن ئیمامی ترمذی دوای باسكردنی ئەو فەرموودەی باسی نەهی كردنی موتعە دەكات و پاشان دەڵێ: (قَالَ أَبُو عِيسَى حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ. وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ وَإِنَّمَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ شَيْءٌ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي الْمُتْعَةِ ثُمَّ رَجَعَ عَنْ قَوْلِهِ حَيْثُ أُخْبِرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَمْرُ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى تَحْرِيمِ الْمُتْعَةِ وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ وَابْنِ الْمُبَارَكِ وَالشَّافِعِيِّ وَأَحْمَدَ وَإِسْحَاقَ. (الترمذي(٤/ ٤٣٠). واتا: فەرمودەكەی عەلی فەرموودەیەكی حەسەن و صەحیحە، كردەوەی پێدەكرێت لەلای ئەهلی عیلم، بەڵام شتێك لە ابن عباس گێڕدراوەتەوە كە ڕوخصەتی داوە بە موتعە كردن، پاشان گەڕاوەتەوە لە وتەكەی دوای ئەوەی هەواڵی پێدرا لەلایەن رسول اللَّه ﷺ وە ئەوە فەرمانی زۆربەی ئەهلی عیلمی لەسەرە لەسەر حەرامی موتعە كردن ئەویش وتەی ثەوری و ابن المبارك و ئیمامی شافعی ئیمامی ئەحمەد و ئیسحاقی لەسەرە.

(الباجي قال في (المنتقى شرح الموطأ ج ٣ ص: ٣٣٤) في كلامه على نكاح المتعة : قد روى ابن حبيب أن ابن عباس وعطاء كانا يجيزان المتعة ثم رجعا عن ذلك ، ولعل عبد الله بن عباس إنما رجع لقول علي له . والله أعلم) واتا: له ابن حەبیب گێڕدرايتەوە کە ابن عباس و عەطاء ئەو دووانە ڕیگەیان بە موتعە دەدا پاشان لەوە گەڕانەوە، لەوانەیە ابن عباس لەبەر وتەکەی ئیمامی عەلی گەڕابێتەوە لەو فەتوایە.

(قال ابن تيمية في إباحة ابن عباس المتعة وأكل لحوم الحمر: روي عن ابن عباس أنه رجع عن ذلك لما بلغه النهي عنها). (منهاج السنة (ج ٢ص: ١٥٦) . واتا: ابن تيمية: دەڵێ: ابن عباس موتعەو خواردنی گوێدرێژی بەحەڵاڵ زانیوە، وە لێشی گێڕدراوەتەوە کە لەو فەتوایەی گەڕاوەتەوە دوای ئەوەی نەهی کردنی ئەو شتانەی پێگەیشتووە.

٢. هەروەها ابن عباس وای دەبینێ کە بکوژی بەئەنقەست تەوبەی بۆ نییە!
(عَنْ سَعِيد بْن جُبَيْرٍ قَالَ : سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاس عَنْ قَوْله : ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ قَالَ : إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا عَرَفَ الإِسْلاَمَ وَشَرَائِعَ الإِسْلاَمِ ثُمَّ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ , وَلاَ تَوْبَةَ لَهُ). (تفسير الطبري (١٠١٨٧). واتا: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پرسیاری ئەو ئایەتەم لە ابن عباس کرد﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ واتا: هەرکەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیماندارێك بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە.

جا ابن عباس دەڵێ: ئەگەر پیاوەکە ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامی زانیبوو پاشان ئیماندارێکی بە ئەنقەست کوشت ئەوە جێگای دۆزەخەو تەوبەی بۆ نییە. جا ڕوونە ئەوەی کە جمهوری سەلەف لەسەرینە کە بکوژی بە ئەنقەست تەوبەی بۆ هەیە ئەگەر هات و تەوبەی کردو پەشیمان بوویەو کاری چاکی کرد. (تفسير ابن كثير" (٢ /٣٨٠)) .((مدارج السالكين" (١/٣٩٢-٣٩٩) ، "تفسير ابن كثير" (١٢٤/٦-١٣٠))

تێبینی: با گومان بەرێك وا گومان نەبات کە ئێمە ابن عباس بەهەڵە دەخەینەوەو لەگەورەیی و لێهاتووی ئەو صەحابە بەڕێزە کەم دەکەینەوە بەڵکو لێرە مەبەستم تەنها ڕوونکردنەوەیەکی شەرعییە لەوەی کەس دوای رسول اللّٰه ﷺ مەعصوم نییەو قابیلی هەڵەیە.

یەکێکی تر لەو شوبهانە ئەوەیە کە هەموو ئەوانەی ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگە خەواریجن! ئایە هەموو ئەوانەی ئیستدلال بەو ئایەتە دەکەن خەواریجن؟ بێگومان نەخێر، چونکە گەر وابێ ئەوە تەعن دانە لەصەحابەی بەڕێز ابن مەسعود کاتێک ئیستدلالی بەو ئایەتە کرد !! کاتێك دەربارەی ڕیشوە پرسیاری لێکرا گوتی: (ذَاكَ الْكُفْرُ ثُمَّ تَلا هَذِهِ الآيَةَ : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (تفسير الطبري: (١٢٠٦١). ئەگەر وابیر بکەنەوە لەهەموو کاتێک ئیستدلالکردن و بەڵگە هێنانەوە بەو ئایەتە بیروباوەڕی خەواریج بێ ئەوە گومڕا بوونە بەگومڕا بوونێکی زۆر ئاشکرا، وە هەروەها ئیمامی عەلی کاتێک کە گوێ بیستی ئەوە بوو کە خەواریجەکان ئەو ئایەتە بەبەڵگە دەهێننەوە وتی: وتەیەکی حەقەو مەبەست پێی باتڵە. واتا قسەکە حەقەو ڕاستە بەڵام ئەوان لەو بابەتە نەیان پێکاوە.

## گومانێکی تر:

دەڵێن گوایە ئیمامی سەعیدی کوڕی جوبەیر گوتویەتی ئەو ئایەتە لە موتەشابیهەکانە

ڕیوایەتەکە بەو شێوەیە هاتووە:

(حَدَّثنَا زَكَرِيًّا، قَالَ: حَدَّثنَا الحسين بْن عِيسَى البسطامي، قَالَ: حَدَّثنَا محمد بْن حرب، قَالَ: حَدَّثنَا ابْن لهيعة، قَالَ: حَدَّثَنِي عطاء بْن دينار الهذلي، عَنْ سعيد بْن جبير ﴿وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ﴾ (آل عمران : ٧) واتا: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: موتەشابیهەکان ئایەتن لە قورئان، خەڵکی کاتێک دەیان خوێنن لە تێگەیشتنیدا توشی نارۆنی دەبن، وە بەهۆی ئەمەوە کەسانێک گومڕا دەبن بانگەشە بۆ ئایەتە موتەشابیهەکان دەکەن، هەموو گروپێک ئایەتێکی قورئان دەخوێننەوە و پێیان وایە ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆیان و هیدایەتی پێ دۆزیوەتەوە وە یەکێک لەو ئایەتە موتاشابیهانەی حروریەکان « تاقمێک بون لە خەواریجەکان » شوێنی دەکەون فەرمایشی الله تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ وە لەگەڵیدا ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ (الأنعام : ١) جا کاتێک بینیان پێشەوە حوکم بە غیری حەق دەکات، دەڵێن: کافر بوو، هەرکەسێکیش کافربێ ئەوا هاوتای بۆ پەروەردگاری داناوە و موشریک بوە، جا ئەمانە پێشەوایانی موشریکن ئەوەیشی گوێڕایەڵیان بکات موشریکە، جا خروج دەکەن ئەو کارە دەکەن کە بینیت، چونکە ئەوان تەئویلی ئەم ئایەتە دەکەن،

وە ئەم ئایەتە دەرگایەکی گەورەی بۆ کردنەوە، وە ووتەکەیان دەربارەی ئەم ئایەتە حەق نیە .(تفسير ابن المنذر : ٢٢٨).

جا ئەگەر سەرنج بدەی دەبینی لەئیسنادی ئەو وتەیە لاوازیەکی زۆر هەیە ئەویش بەبوونی : ابْن لهيعة جا کێ هەیە ئەو ابن لهيعەيە نەناسێت کەسێك هەر تۆزێك لە زانستی فەرموودە شارەزا بێت ئەوە چاك دەزانێ کە ابن لە هيعە لاوازە ! ئەوانەی ابن لەهيعەيان بەلاواز داناوە:

١. يحيى بن سعيد القطان: قال الترمذي: (ابن لهيعة ضعيف عند أهل الحديث ضعفه يحيى بن سعيد القطان وغيره من قبل حفظه). (الجامع: ح/١٠). واتا: ئیمامی ترمذی دەڵێ: ابن لەهيعە لەلای ئەهلی حەدیث لاوازە، يحيى بن سعيد القطان و بێجگە لەویش بە لاوازیان داناوە لەلایەنی حیفظیەوە.

(قال الحميدي عن يحيى بن سعيد: كان لا يراه شيئاً). [التاريخ الكبير: ٨٢/٥ ـ ٨٣ ـ ت/٦٦٤٤]، [التاريخ الصغير: ص/٦٩ ـ ت/١٩٠]، [الجرح والتعديل: ١٤٦/٥ـ ت/٦٨٢]، [ضعفاء العقيلي: ٢٩٤/٢ ـ ت/٨٦٩]، [الكامل لابن عدي: ٢٣٨/٥ ـ ت/٩٧٧]، [تاريخ دمشق: ١٥٣/٣٢]. واتا: يەحيای کوڕی سەعيد ابن لەهيعەی بەهیچ نەدەزانی.

(وقال معاوية بن صالح سمعت يحيى بن معين يقول: عبد الله بن لهيعة الحضرمي ضعيف). [ضعفاء العقيلي: ٢/٦٩٦ـ ت/٨٦٩] واتا: يەحيای کوڕی مەعين دە يگوت: ابن لەهيعە لاوازە.

٢. ابن طهمان: ابن لهيعة ليس بشيء تغير أو لم يتغير. [سؤالاته: ص/١٠٨ ـ س/٣٤٢]
واتا: ابن طهمان دەڵێ: ابن لەهيعە هیچ نییە جا چ حیفظی گۆڕا بێ یان نەگۆڕابێ.

٣. أحمد بن حنبل وقال عبد الرحمن: (حدثنا حرب بن إسماعيل الكرماني فيما كتب إليَّ قال: سألت أحمد بن حنبل عن ابن لهيعة فَضَعَّفَهُ). [الجرح والتعديل: ١٤٧/٥ ـ ت/٦٨٢]، [تاريخ دمشق: ٣٢ / ١٥٤]. واتا: حربی کوڕی ئیسماعیل دەڵێ: پرسیارم لە ئیمامی ئەحمەد کرد دەربارەی ابن لەهیعە ئەویش بە لاوازی دانا. گوتم: ئەوە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی دەڵێن ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتەکەی ابن لەهیعەی قەبوڵە ! ئیمام خۆی لەچەندین شوێن بەلاوازی داناوە چۆن لەشتێکی ئاوا هەستیار شتی لێ وەردەگرێ ؟!!

٤. أبو حاتم الرازي بعد أن سأله ابنه عبد الرحمن عن بعض الأحاديث: هذا من تخاليط ابن لهيعة. [العلل: ٣٧/٤ ـ س/١١٣٣ ٣٨/٤ ـ س/ ١١٣٤ ٥٥٨/٦ ـ س/٢٧٥٥] واتا: ئەبو حاتم دوای ئەوەی کوڕەکەی پرسیاری لێدەکات دەربارەی هەندێك فەرمووده: وتی: ئەوە لە تێکەڵیەکانی ابن لەهیعەیە.

٥. عبد الرحمن قلت لأبي: إذا كان يروي عن ابن لهيعة مثل ابن المبارك وابن وهب يحتج به؟ قال: لا. (الجرح والتعديل: ١٤٧/٥ ـ ت/٦٨٢ ٢٣٥/٥ ـ ت/١١١١) واتا: عبدالرحمن دەڵێ: پرسیارم لە باوکم کرد ئەگەر نمونەی وەکو ابن المبارك و ابن وهب لە ابن لەهیعەیان گێڕابۆوە ئایە دەکرێت بەبەڵگە؟ وتی: نەخێر. گوتم: ئەوە مەزهەبی ئەبو حاتمە کە فەرموودەکانی ابن لەهیعە بەبەڵگە نازانێ ئەگەرچی خەڵکی متمانە پێکراویش لێی بگێڕنەوە.

٦. عباس الدوري عن يحيى: ابن لهيعة لا يحتج بحديثه. [سؤالاته: س/ ٥٣٨٨]، [ضعفاء العقيلي: ٦٩٦/٢ ـ ت/٨٦٩]، [الكامل لابن عدي: ٢٣٧/٥ ـ ت/٩٧٧]، [تاريخ دمشق: ١٥٥/٣٢] واتا: عباس الدوري لە یەحیاوە دەگێڕێتەوزە دەڵێ گوتیەتی: ئیتجاج بە فەرموودەکانی ابن لەهیعە ناکرێت.

٧. الجوزجاني: ابن لهيعة لا يوقف على حديثه و لا ينبغي أن يحتج به ولا يغتر بروايته. [أحوال الرجال: س/٢٧٤]، [الكامل لابن عدي: ٢٣٩/٥ ـ ت/٩٧٧]، [تاريخ دمشق: ١٥٥/٣٢] واتا: الجوزجاني دەڵێ: ابن لەهیعە لەسەر فەرموودەکانی ناوەسترێت و ناشبێ کە بکرێت بەبەڵگەو ئیحتجاجی پێ بکرێت، وە بە ڕیوایەتەکانی هە ڵناخەتێنرێ. گوتم: ئای چەند زۆرن ئەوانەی دڵیان بەو ڕیوایەتە لاوازانە خۆشە جا کەسێك پێچەوانەیان بکات بەگومڕاو خەواریجی دەزانن! لەسەر بنەمیەکی لاواز دەتەوێت مەنهەجەکەت ببەی بەڕێوە!

٨. الدارقطني ابن لهيعة لا يحتج بحديثه. [السنن: ١٢٩/١ ـ ح/٢٤٣ /٣ ٩ – ح/١٩٨١] واتا: ئیمامی دارەقوتنی دەڵێ: ابن لەهیعە فەرموودەکانی ناکرێت بە بەڵگە.

تێبینی: با گومان بەرێك وا گومان نەبات ئێمە نکوڵی لەموتەشابیهی ئەو ئایەتە دەکەین نەخێر، ئەو ئایەتە موتەشابیهە بەڵام دەبێ وریابی وەك لەپێشوو باسمان کرد خەواریجەکان ئەو ئایەتەیان دەکردە بەڵگە بۆ ئەو کەسانەی هەر تاوانێکیان بکردایە دەیان گوت حوکمی بەوە نەکردووە کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە و تەکفیریان دەکرد بەڵام هەر حەزمان کرد بێ مستەوایی ئەوانە نیشان بدەین کەچەندە لاوازن لەزانستی فەرموودە بە تایبەت عیلەل !

## ئایە مەبەست لەو ئایەتە کێ دەگرێتەوە ؟

ئەگەر سەیری وتەی صەحابەو تابیعیەکان بکەین دەبینین ڕاجیایی هەیە دەربارەی ئەو ئایەتە هەیە گوتویەتی دەربارەی موسوڵمانانە هەیە گوتویەتی دەربارەی ئەهلی کیتابە، هەیە گوتویەتی: الکافرون دەربارەی موسوڵمانانە، الظالمون دەربارەی یەهودیەکانە، الفاسقون دەربارەی نەصرانیەکانە. کەواتە ڕاجیایی هەیە ئایە دەربارەی موسوڵمانانە یان یەهودە یانیش نەصاراکانە، وە هەندێکیش پێیان وابووە لەدەربارەی موسوڵمانانە بەڵام مەبەست پێی کفر دون کفرە وەك طاوس و غەیری ئەویش..

ئێستا دێین باسی ئەوانە دەکەین کە پێی وابووە دەربارەی موسوڵمانانە بۆ ئەوەی ئەو گومانەش بڕەوێنینەوە کە کەسانێك پێیان وابووە تەنها دەربارە ی یەهودو نەصارا بووە ! پشتیان بەهەندێك وتە بەستووەو وازیان لەهەندێك هێناوە:

١. صەحابەی بەڕێز ابن مەسعود پێی وابووە دەربارەی موسوڵمانانە؛ (حَدَّثَني يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ ، قَالَ: ثنا هُشَيْمٌ ، قَالَ : أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْمَلك بْنُ أَبي سُلَيْمَانَ عَنْ سَلَمَةَ بْن كُهَيْل ، عَنْ عَلْقَمَةَ، وَمَسْرُوق أَنَّهُمَا سَأَلا ابْنَ مَسْعُود عَن الرِّشْوَة، فَقَالَ: منَ السُّحْت. قَالَ: فَقَالا: أَفي الْحُكْم ؟ قَالَ : ذَاكَ الْكُفْرُ. ثُمَّ تَلا هَذه الآيَةَ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (تفسير الطبري: (١٢٠٦١)).
واتا: يعقوب بن ابراهيم بۆی باسکردین فەرمووی: هشيم بۆی باسکردین، عبدالملك بن أبي سلمان پێمانی گوت، لە سلمة بن کهيلەوە لە عقلمە و مسروقەوە، پسیاریان کردووە لە ابن مسعود دەربارەی سوو، فەرموویەتی: بریتیە لە سحت،(حرام) وتیان ئەی لە حوکمدا؟، فەرمووی: ئەویان کوفرە، دوای ئەو ئایەتەی خوێندەوە: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن.

٢. هەروەها صەحابەی بەڕێز ابن عباس پێی وابووە دەربارەی موسوڵمانانەو کوفرێکی دەرخەرە لەمیللەتی ئیسلام (قال الإمام عبد الرزاق الصَّنْعاني في " تفسيره : أخبرنا معمر عن ابن طاوس عن أبيه قال : سُئِلَ ابن عباس عن قوله: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُم بِمَا أَنْزَلَ اللَّه فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ ؟ قال : هي به كفر).

(تفسير ابن كثير " ( ٢ / ٩٧ ( وعلَّقه أبو عُبيد في " الإيمان " ( ص ٩٤ ) ، والبغوي في " معالم التنزيل " ( ٢ / ٢٦٠

واتا: پرسیارکرا لە ابن عباس دەربارەی ئەو ئایەتە: مَنْ لَمْ يَحْكُم بِمَا أَنْزَلَ اللَّه فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ. فەرمووی: (هِيَ بِهِ كُفْرٌ) واتا: ئەمە کوفرە.

٣. بە سەنەدی تریش هاتوە بە صەحیحی پرسیار کراوە لە ابن عباس الله لێ ڕازی بێت لە تەفسیری ئایەتی : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾؛ لە وەڵامدا ووتویەتی : ئەوەندەی بەسە کە بە کافر ناوی هاتوە و الله کافری کردوە. (حدثنا الحسن بن أبي الربيع الجرجاني قال: أخبرنا عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه قال : سُئل ابن عباس عن قوله: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾؟ قال: كفى به كفره).

(أخرج وكيع في أخبار القضاة ٤١/١).واتا: پرسیار کرا لە ابن عباس لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ فەرمووی: ئەوەندەی بەسە کە بە کافر ناوی هاتوە و الله کافری کردوە.

٤. صەحابەی بەڕێز حوذەیفە پێی وابووە ئەو ئایەتە دەربارەی موسوڵمانانیشە. (عَن الثَّوْرِيِّ , عَنْ حَبيب بْن أَبي ثَابت , عَنْ أَبي الْبَخْتَرِيِّ , قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ حُذَيْفَةَ عَنْ هَؤُلَاءِ الْآيَات ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئكَ هُمُ الْكَافرُونَ﴾ (المائدة: ٤٤) ﴿فَأُولَئكَ هُمُ الظَّالمُونَ﴾ ﴿فَأُولَئكَ هُمُ الْفَاسقُونَ﴾ (آل عمران: ٨٢) , قَالَ: فَقيلَ ذَلكَ في بَني إسْرَائيلَ؟ , قَالَ: « نعْمَ الْإخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إسْرَائيلَ إنْ كَانَتْ لَهُمْ كُلُّ مُرَّة , وَلَكُمْ كُلُّ حُلْوَة , كَلَّا وَاللَّه لَتَسْلُكُنَّ طَريقَهُمْ قَدَّ الشِّرَاك ) ((تفسير عبدالرزاق(ج:٢/ ص:٢٠ واتا: پیاوێك پرسیاری لە حوذەیفە كرد دەربارەی ئەو ئایەتانە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئكَ هُمُ الْكَافرُونَ﴾ (المائدة: ٤٤), ﴿فَأُولَئكَ هُمُ الظَّالمُونَ﴾ ﴿فَأُولَئكَ هُمُ الْفَاسقُونَ﴾ (آل عمران: ٨٢) پیاوەكە گوتی: دەگوترێت ئەو ئایەتانە دەربارەی بەنی ئیسرائیلە. حوذەیفەش گوتی: باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلن، ئەگەر هەموو تاڵیەك بۆ ئەوان بێت ئەو هەموو شیرینیەك بۆ ئێوەیە ؟ نەخێر سوێند بە اللَّه تعالی شوێن ئەوان دەكەون ڕێچكە بەڕێچكە.

٥. سفيان عَنْ حَبِيب بْن أَبِي ثَابت عَنْ أَبِي الطُّفَيْل قَالَ ((قِيلَ لحذيفة نزل هَذه الْآيَةُ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ الله قَالَ نِعْمَ الْإِخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيلَ كَانَ لَهُمْ مُرَّةٌ وَلَكُمْ حلوة لتسلكن طريقهم قد الشرك)) (تفسير سفيان الثوري)

واتا: گوترا بە حوذەیفە ئەو ئایەتە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دابەزیوە، حوذەیفەش گوتی: باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلن، ئەگەر هەموو تاڵیەك بۆ ئەوان بێت ئەوا هەموو شیرینیەك بۆ ئێوەیە ؟ شوێن ئەوان دەکەون ڕیچکە بەڕیچکە.

٦. حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَنْبَا جَرِيرٌ، عَنِ الْأَعْمَش، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّام بْن الْحَارث، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ حُذَيْفَةَ فَذَكَرُوا: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (المائدة: ٤٤) فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: إِنَّمَا هَذَا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: نِعْمَ الْأُخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيلَ أَنْ كَانَ لَكُمُ الْحُلْوُ وَلَهُمُ الْمُرُّ، كَلَّا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ حَتَّى تُحْذَى السُّنَّةُ بِالسُّنَّةِ حَذْوَ الْقُذَّةِ بِالْقُذَّةِ (السنة للمروزى(ص:٢٥)

واتا: هَمَّام بْن الْحَارث دەڵێ: ئێمە لەلای حوذەیفە بوین ئەو ئایەتەیان باسکرد: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ پیاوێك گوتی: بەڕاستی ئەو ئایەتانە دەربارەی بەنی ئیسرائیلە. حوذەیفەش گوتی: باشترین برا بۆ ئێوە بەنی ئیسرائیلن، ئەگەر هەموو تاڵیەك بۆ ئەوان بێت ئەو هەموو شیرینیەك بۆ ئێوەیە ؟ نەخێر سوێند بە اللَّه ﷻ شوێن ئەوان دەکەون ڕیچکە بەڕیچکە.

٧. ئیمامی شەعبی پێی وابووە ئەو ئایەتە دەربارەی موسوڵمانانە: وَقَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ عَنِ الثَّوْرِيِّ عَنْ زَكَرِيَّا عَنِ الشَّعْبِيِّ : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾ قَالَ : لِلْمُسْلِمِينَ . (ابن كثير(ج:٣/ ص:١٢٠). واتا: شەعبی دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ بۆ موسوڵمانانە.

٨. وَقَالَ ابْنُ جَرِير: حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُثَنَّى حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَد حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَن ابْن أَبِي السَّفَر عَنِ الشَّعْبِيِّ : ﴿وَمَن لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قَالَ: هَذَا فِي الْمُسْلِمِينَ ﴿وَمَن لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ قَالَ: هَذَا فِي الْيَهُودِ ﴿وَمَن لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ قَالَ: هَذَا فِي النَّصَارَى (ابن كثير(ج:٣/ ص: ١٢٠ ) واتا: لە شەعبیەوە دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ دەڵێ: ئەوە دەربارەی موسوڵمانانە، ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ئەوە بۆ یەهودیەکانە، ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ئەوە بۆ نەصرانیەکانە.

٩. أَخْبَرَنَا حميد بْن الربيع؛ قال: حَدَّثَنَا ابن يمان، عَن سُفْيَان، عَن جابر، عَن الشعبي؛ قال: الأولى لأهل الإسلام، والثانية لليهود، والثالثة للنصارى. واتا: لەشەعبیەوە دەربارەی ئەو ئایەتە فەرموویەتی: یەکەم (واتا: الكافرون دەربارەی موسوڵمانانە، دووەم: (واتا: الظالمون دەربارەی یەهودە، سێیەم: (واتا: الفاسقون دەربارەی نەصارایە. حَدَّثَنَا إسحاق بْن المحسن؛ قال: حَدَّثَنَا أَبُو حذيفة، عَن سُفْيَان مثله(أخبار القضاة (ج:١/ ص:٤٣). واتا: سوفیانیش بەهەمان شێوەی شەعبی گوتووە.

١٠. أَخْبَرَنَا الثوري، عَن منصور، عَن إبراهيم؛ قال: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَاتُ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ وَرُضِيَ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ بِهَا. (أخبار القضاة (ج:١/ ص:٤٣). واتا: ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێ: ئەو ئایەتە دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزی، وە بۆ ئوممەتەش پێی ڕازی بووە (واتا: دەربارەی موسوڵمانانیشە).

١١. في تفسير زيد بن أسلم في قوله: وليحكم أهل الإنجيل بما أنزل الله فِيْهِ ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الفاسقون﴾؛ قال: بِهَذَا حكم لكتابه، فمن ترك الحكم بكتاب الله فقد كفر. واتا: عبدالرحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ دەڵێ: اللَّه تعالى هەر بەو شێوە یەش حوکمی لەسەر کیتابەکەی داوە، جا هەر کەسێك حوکمکردن

بە قورئان تەرك بكات ئەوە بێ باوەڕە. گوتم: سەرنج بدە تەرككردنی حوكمی گوت نەك تەبدیل و تەشریع !، وە وشەی الفاسقون ـی لێرە بەكوفری مخرج من الملة وەسفكرد.

وە لەپاشان لەتەفسیری وشەی: الكافرون والظالمون والفاسقون, دەڵێ: (والمراد بالظّلم والفسق هو الكفر) واتا: مەبەست لەو زوڵم و فیسقە كوفرە.

١٢. حَدَّثَنِي الْحَسَن بْن أبي الفضل؛ قال: حَدَّثَنَا سهل بْن عثمان؛ قال: حَدَّثَنَا عَبْدُ المطلب بْن زياد، عَن ثابت الثمالي؛ قال: قلت لأبي جعفر: (إن المرجئة يخاصموننا في هذه الآيات؛ فقلت: إنهم يزعمون أنها في بني إسرائيل؛ فقال: نعم الإخوة نحن لبني إسرائيل إن كان حلو القرآن لنا، ومره لهم؛ نزلت فيهم ثم جرت فينا). واتا: ثابت الثمالي دەڵێ: بەئەبو جەعفەرم گوت: بەڕاستی مورجیئە، موشتومڕمان لەگەڵ دەكەن دەربارەی ئەو ئایەتانە؛ گوتم: ئەوان وا نیشان دەدەن ئەو ئایەتانە دەربارەی بەنی ئیسرائیلە؛ ئەویش گوتی: ئێمە باشترین براین بۆ بەنی ئیسرائیل، ئەگەر شیرینی قورئان بۆ ئێمە بێت تاڵیەكەی بۆ ئەوانە، لەدەربارەی ئەوان دابەزی بەڵام دواتر لەدەربارەی ئێمە جێ بەجێ بوو. گوتم: لەئیسنادەكەی لاوازیەك هەیە بەهۆی: ثابت الثمالي

## وەڵامی شوبهەیەك:

ڕیوایەتێك هاتووە کە گوایە ابن عباس پێی وابووە ئەو سێ ئایەتە هەرسێکی دەربارەی یەهوودە، ڕیوایەتەکە بەو شێوەیە: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، قَالَ: نا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنادِ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ و: الظالمون و: الفاسقون في اليهود خاصة. (تفسير سعيد بن منصور ج:٤/ ص:٤٨٥). جا سەنەدەکەی لاوازە چونکە کەسێکی تێدایە بەناوی: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنادِ موحەقیقی ئەو تەفسیرەش ئەو ئەثەرەی بەلاواز داناوە! دەڵێ:
سنده ضعيف لما تقدم عن حال عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ.

پاشان دێینە سەر ئەو سێ وشەیە الكافرون و الظالمون و الفاسقون ئایە مەبەست پێی چییە؟

اللَّه تعالی لەقورئاندا باسی کوفری کردووە بە لەفزی جیاواز، وەك لەفزی الظلم، وە لەفزی الفسق وە لەفزی الکفر، هیچ جیاوازیەکیان نییە ئەگەر بە ڕەهایی هات.

لەپێشوودا ڕوونمان کردەوە کە وشەی (الكُفْر، والكَافِر، والكُفَّار، والكَافِرُون الكَافِر) لە قورئان و فەرموودە هات ئەوا کوفری گەورەیە، زانایانی زمانەوانی دەڵێن: جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان لەفزی کوفرێك کە بەشێـوەی نکرة نەناسراوە هاتبێت وەك: (كُفْر، وكافر، وكُفار، وكافرون) لەگەڵ ئەوەی بەشێوازی مەعریفە هاتبێت کە (ال) بچێتە سەر وەك (الكُفْر، والكافر، والكفار، والكافرون).

بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بەشێوەی مەعریفە (ناسراو) هات ئەوا مەبەستی لەوەیە کە کوفری گەورەیە ئەمیش بەهۆی چوونی (الــ) بۆسەری کە دەبێتە هۆی ئەوەی بیبات بەرەو ئەوپەڕی زیادەڕۆییەوە ئەمەش هیچ خیلافێکی تێدا نییە لەنێوان زانایانی زمانەوانیدا.

جا ڕوونه که ئەو ئایەتەش: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ وشەی ﴿الْكَافِرُونَ﴾ ئەلیف و لامی پێوە لکاوە بۆیە کوفری گەورەیە.

دێینە سەر ئایەتەکە لەڕووی زمانەوانیەوە وشەی: (مَنْ) لێرە بەمانای چی دێت ؟

ئیمامی قاسمی دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ دەربارەی وشەی: مَنْ دەڵێ: (الاعْتِبَارَ بِعُمُومِ اللَّفْظِ لَا بِخُصُوصِ السَّبَبِ، وَكَلِمَةُ: "مَنْ" وَقَعَتْ فِي مَعْرِضِ الشَّرْطِ فَتَكُونُ لِلْعُمُومِ). (تفسیر القاسمي (ج:٦/ ص:١٩٩٨- ٢٠٠٠)). واتا: عیبرەت بەگشتی لەفزەکەیە نەك بەتایبەتکردنی هۆکارەکەی، وە وشەی مَنْ لێرە لەدەربارەی مەرج و شەرت هاتووە بەوەش بۆ گشتی دەبێت.

سەیربکە لەڕووی زمانەوانیەوەش وشەی: "مَنْ" بەمانای عام دێت واتا هەموان دەگرێتەوە. وە وشەی فَأُوْلَئِكَ فائەکە لەزمانی عەرەبی فائی شەرطیە، یان سەبەبیە، جا ئەوەی پێش فائەکە دێت شەرطە، ئەوەشی لەپاشی دێت وەڵامی شەرطەکەیە، جا ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ ئەوە شەرطەو ﴿فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ وەلامی شەرطەکەیە. فائەکە سەبەبیە لێرەدا اللَّه تعالی دەفەرموێت بۆچی ئەوانە بێباوەڕ بوون ؟ واتا بەهۆکارو سەبەبی چیەوە بوو ؟ بەهۆی ئەوەی: ﴿لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ لەبەر ئەوەی حوکمیان بەوە نەدەکرد کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە.

پاشان ئیمامی قاسمی دەڵێ: ﴿وَمَن لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنـزَلَ اللَّهُ﴾ أَيْ: كَائنًا مَنْ كَانَ، دُونَ الْمُخَاطَبِينَ خَاصَّةً.. حَيْثُ عَلَّقَ فِيهِ الْحُكْمَ بِالْكُفْرِ بِمُجَرَّدِ تَرْكِ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى. فَكَيْفَ وَقَدِ انْضَمَّ إِلَيْهِ الْحُكْمُ بِخِلَافِهِ؟ (تفسير القاسمي (ج:٦/ ص:١٩٩٨- ١٩٩٩)). واتا: هەرکەسێك حوکم بەوە نەکات کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە واتا: هەرکێیەك بێت بەبێ ئەوەی وتەکە بۆ کەسانێکی تایبەت وترابێ... بەجۆرێك حوکمی کوفری بەسەردان بەتەنها لەبەر ئەوەی تەرکی حوکمی ئەوەیان کردبوو کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، جا چۆن دەبێت گەر حوکمێکی پێچەوانەی تری بدرێتە پاڵ ؟ جا سەرنج بدە گوتی: عَلَّقَ فِيهِ الْحُكْمَ بِالْكُفْرِ بِمُجَرَّدِ تَرْكِ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى. واتا: بەجۆرێك حوکمی کوفری بەسەردان بەتەنها لەبەر ئەوەی تەرکی حوکمی ئەوەیان کردبوو کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە. تەنها بەهۆی ترك کردنیان نەك تەشریع و تەبدیل ! وە ئەوە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی وتەکەی تری ئیمامی قاسمی دەکەنە بەڵگە بۆ خۆیان و دەڵێن خەواریج ئەو ئایەتە دەکەنە بەڵگە !

جا ئەوە ئیمام خۆی دەڵێ بەتەنها بەترکردنی حوکم حوکمی کوفری بەسەر دان !

جا دێینە سەر وشەی الظالمون: ئەو وشەیە بۆ چی مەبەست و بە چ مانایەك بەکارهاتووە لەم ئایەتە و ئایەتەکانی تری قورئانی پیرۆزدا .

هەروەکو لەپێشوو باسمان کرد دەربارەی ئەو لەفزانەی کەوا ئەلیف و لامی پێوە لکاوە هەریەك لە وشەکانی والکافرون والظالمون الفاسقون لەو ئایەتانە ئەوە مەبەست پێی کوفرە هەرسێکی چونکە بەناسراو هاتووە و بەرەهایی باسکراوە، قورئان شاهێدێ ئەوە دەدات، ئەگەر هاتوو هیچ نەصێك لەئایەت و فەرموودە نەبوو تەقیید و بیبەستێتەوە بەکوفری بچووك یان فیسقی بچووك یان زوڵمی بچوك، ئەوە مەبەست پێی لایەنی گەورەو دەرخەرە لەدین، وە بۆ ئەوەی لێت تێك نەچێ خوێنەری بەرێز وشەی کوفر و فیسق و زوڵم بەدوو شێواز دێت کوفرێك کەدەرخەرە لەمیللەتی ئیسلام، کوفرێکیش دەرخەر نییە، فیسقێك کەدەرخەرە لەمیللەتی ئیسلام، فیسقێکیش دەرخەر نییە، وە زوڵمێك کەدەرخەرە لەمیللەتی ئیسلام، زوڵمێکیش کەدەرخەر نییە، بۆ ئەوەی ئەوانەی نەخۆشیان لەدڵە تانە نەدەن بڵێن کە هەموو کوفرو فیسق و زوڵمێکیان پێ دەرخەرە نا، وە لە پێشوو ئاماژەمان پێدا وتەی زانایانمان هێناوە لەوانە وتەکەی: شێخ عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن دەفەرمووێت: (ولفظ الظلم والمعصية والفسوق والفجور والموالاة والمعاداة والركون والشرك ونحو ذلك من الألفاظ الواردة في الكتاب والسنة قد يراد مُسَّماها المطلق وحقيقتها المطلقة، وقد يُراد بها مطلق الحقيقة، والأول هو الأصل عند الأصوليين، والثاني لايُحمل الكلام عليه إلا بقرينة لفظية أو معنوية، وإنما يُعرف ذلك بالبيان النبـوي وتفسير السنة). (الرسائل المفيدة: (٢١_٢٢). واتە: لەفزی ستەم(زوڵم) و تاوان و فسق خراپە و دۆستایەتی

و دوژمنایەتی و مەیل بۆ کافران و شیرك (ال ی پێوە لکابێت) لەو لەفزانەی کەهاتوە لەقورئان و سوننەتدا لەوانەیە مەبەستی لەکوفری گەورە بێت و لەوانەشە مەبەستی لە کوفری بچووك بێت، یەکەمیان ئەصڵە و دروستە لای زانایانی ئوصولی (واتا: ئەصڵ وایە هەرلەفزێك بەناسراوی هات ئەلیف و لامی پێوە بوو ئەوە مەبەست پێی کوفری گەورەیە) دووەمیشان لەسەری دانامەزرێت مەگەر بەبەڵگەیەك نەبێت، ئەمیشیان بەڕوونکردنەوەو تەفسیرکردنی سوننەتەوە دەزانرێت).

هەروەها ابن تیمیة وتەیەکی مُحَمَّدُ بْنُ نَصْر نەقڵ دەکات و دەڵێ: (وَكَذَلِكَ الْفِسْقُ فسقان ": فِسْقٌ يَنْقُلُ عَنْ الْمِلَّةِ وَفِسْقٌ لَا يَنْقُلُ عَنْ الْمِلَّةِ فَيُسَمَّى الْكَافِرُ فَاسِقًا وَالْفَاسِقُ مِنْ الْمُسْلِمِينَ فَاسِقًا ذَكَرَ اللَّهُ إبْلِيسَ فَقَالَ: ﴿فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾ وَكَانَ ذَلِكَ الْفِسْقُ مِنْهُ كُفْرًا وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ﴾ يُرِيدُ الْكُفَّارَ دَلَّ عَلَى ذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (مجموع الفتاوى(٣٢٨/٧_ ٣٢٩). واتا: بەهەمان شێوە وشەی فیسق دوو جۆر فیسقە، فیسقێك لەدینی ئیسلامی دەباتە دەرەوە، وەفیسقێك کەلەدینی ئیسلامی ناباتە دەرەوە، جا بە بێباوەڕ دەگوترێت فاسق، وە فاسقیش لەموسوڵمانان فاسیقە، اللَّه تعالی باسی شەیطان دەکات دەڵێ: لەگوێڕایەڵی و فەرمانی اللَّه تعالی دەرچوو. ئەو فیسقە کوفر بوو، اللَّه تعالی دەفەرموویێت: بەڵام

ئەوانەی کە فاسق بوونەو گوێڕایەڵی اللَّه تعالی پاشان پێغەمبەرکەیان نەکردووە شوێنی مانەوەیان ئاگری دۆزەخە. مەبەست پێی کافرەکانە. بەبەڵگەی وتەی اللَّه تعالی کەلەدوای ئەوە دەفەرموویێت: هەر کاتێك ویستیان لێی دەرچن دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی پێیان دەوترێت: بچێژن سزای ئەو ئاگرەی کە بڕواتان پێی نەبوو.

هەروەها دەڵێ: (وَسُمِّيَ الْفَاسِقُ مِنْ الْمُسْلِمِينَ فَاسِقًا وَلَمْ يُخْرِجْهُ مِنْ الْإِسْلَامِ. قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ وَقَالَ تَعَالَى: ﴿فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾ فَقَالَتْ الْعُلَمَاءُ فِي تَفْسِيرِ الْفُسُوقِ هَاهُنَا: هِيَ الْمَعَاصِي) (مجموع الفتاوى(٣٢٨/٧_٣٢٩). واتا: وە فاسقیش هەیە لەموسوڵمانان ناوی لێنراوە فاسق، لەئیسلام نەیبردۆتە دەرەوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخیەکاندان. وە اللَّه تعالی دەفەرموویێت: حەج لە چەند مانگێکی دیاریکراودایە و جا ئەوەی کە لەو مانگانەدا دەستبەکار بوو و بڕیاریدا حەج بکات، ئەوە دەبێت نزیکی هاوسەری نەکەوێت و شەڕە چەپۆک و گوناهو موجادەلە و گوفتاری

نادروست ئەنجام نەدات. زانایان دەربارەی تەفسیری الْفُسُوقِ لێرەدا دەڵێن: بریتییە لەتاوان.

وەهەروەها دەربارەی زوڵم و شیرك كوفریش دەڵێ: (قَالُوا: فَلَمَّا كَانَ الظُّلْمُ ظلمين وَالْفسقُ فسقين كَذَلكَ الْكُفْرُ كُفْرَان: أَحدُهُمَا يَنْقُلُ عَنْ الْملَّة) و (الْآخَرُ لَا يَنْقُلُ عَنْ الْملَّة، وَكَذَلكَ الشِّرْكُ " شرْكَان ": شرْكٌ في التَّوْحيد يَنْقُلُ عَنْ الْملَّة وَشرْكٌ في الْعَمَل لَا يَنْقُلُ عَنْ الْملَّة وَهُوَ الرِّيَاءُ قَالَ تَعَالَى: ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لقَاءَ رَبِّه فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالحًا وَلَا يُشْركْ بعبَادَة رَبِّه أَحدًا﴾يُريدُ بذَلكَ الْمُرَاءَاةَ بِالْأَعْمَالِ الصَّالحَة) (مجموع الفتاوى(٣٢٨/٧_ ٣٢٩). واتا: دەڵێن: مادام زوڵم دووجۆر بوو وە فیسقیش دوو جۆر بوو، بەهەمان شێوە كوفریش دوو جۆرە، یەكێكیان لەدین دەیباتە دەرەوە، ئەوەی تر نایباتە دەرەوە لەدین، بەهەمان شێوە شیركیش دوو جۆرە: شیركێك لەتەوحیدا لەدین دەیباتە دەرەوە، شیركێك لەكردەوە لەدین نایباتە دەرەوە كە بریتییە لەشیركی ڕیایی، اللَّه تعالى دەفەرمووێت: هەر كەسێك بەهیوای ئەوەیە بگات بە اللَّه تعالى با كردەوەی چاك ئەنجام بدات و هیچ كەسێك نەكات بە هاوبەشـــی اللَّه تعالى لەپەرستنیدا. جا مەبەست پێی لەوە ڕیایی كردنە بەكردەوەی چاك.

جا باشترین تێگەیشتن بۆ قورئان بۆ ئەوەی بە تەواوی لێی تێبگەیت وە بزانی مەبەستی چییە ئەوا بریتیە لە تەفسیر كردنی ئایەت بە ئایەت.

ابن تيمية فەرموویەتی: (إِذَا لَمْ نَجِدْ التَّفْسِيرَ فِي الْقُرْآنِ وَلَا فِي السُّنَّةِ رَجَعْنَا فِي ذَلِكَ إلَى أَقْوَالِ الصَّحَابَةِ فَإِنَّهُمْ أَدْرَى بِذَلِكَ لِمَا شَاهَدُوهُ مِنْ الْقُرْآنِ وَالْأَحْوَالِ الَّتِي اخْتَصُّوا بِهَا؛ وَلِمَا لَهُمْ مِنْ الْفَهْمِ التَّامِّ وَالْعِلْمِ الصَّحِيحِ وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ؛ لَا سِيَّمَا عُلَمَاؤُهُمْ وَكُبَرَاؤُهُمْ كَالْأَئِمَّةِ الْأَرْبَعَةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ وَالْأَئِمَّةِ الْمَهْدِيِّينَ: " مِثْلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ). (مقدمة في أصول التفسير: ٩٥) واتا: جا لەو حاڵەتەدا گەر تەفسیرت دەست نەکەوت لە قورئان ئایەت بە ئایەت وە لە سونەتیشدا دەستت نەکەوت ئایەت بە فەرموودە دە گەڕێیەوە بۆ وتەی هاوەڵان ، چونکە ئەوان زاناترن لەو بارەیەوە ، لەوەی کە لە قورئان بینیویانە و ئەو حاڵەتانەی کە تایبەت کراون بە قورئان ، لەوەی کە تێگەشتنێکی تەواو و زانستێکی دروستیان هەیە بێگومان ئەمەش زاناکانیان و گەورەکانیان، وە چوار پێشەواکەی خەلیفەی ڕاشدین، پێشەواکان، وەکو: عبداللّەی کوڕی مەسعود.

هەروەها ابن تيمية دەفەرموویت: (فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ: فَمَا أَحْسَنُ طُرُقِ التَّفْسِيرِ؟ فَالْجَوَابُ: أَنَّ أَصَحَّ الطُّرُقِ فِي ذَلِكَ أَنْ يُفَسَّرَ الْقُرْآنُ بِالْقُرْآنِ؛ فَمَا أُجْمِلَ فِي مَكَانٍ فَإِنَّهُ قَدْ فُسِّرَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ وَمَا اُخْتُصِرَ مِنْ مَكَانٍ فَقَدْ بُسِطَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ فَإِنْ أَعْيَاك ذَلِكَ فَعَلَيْك بِالسُّنَّةِ فَإِنَّهَا شَارِحَةٌ لِلْقُرْآنِ وَمُوَضِّحَةٌ لَهُ؛ بَلْ قَدْ قَالَ الْإِمَامُ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ إدْرِيسَ الشَّافِعِيُّ: كُلُّ مَا حَكَمَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَهُوَ مِمَّا فَهِمَهُ مِنْ الْقُرْآنِ) (مجموع الفتاوي ١٣/٣٦٣). واتا: جا گەر کەسێك وتی : چاکترین ڕێگا چییە بۆ تەفسیر؟ وەڵامەکەشی ئەوەیە کە باشترین ڕێگا بۆ تەفسیرکردن بریتیە لە تەفسیر کردنی قورئان بە قورئان لە هەر شوێنێک پێیوستی بە ڕوونکردنەوە بێت ئەوا لە شوێنێکی تر ڕوونی کردۆتەوە ، لەهەر شوێنێکیش بە پوختی باسکرا بێت ئەوا لە شوێنێکی تر بە فراوانی باسکراوە ، جا گەر لەوە نە گەشتیتە ئەنجام ئەوا تەفسیری ئایەت بکە بە سوننەت چونکە ڕوونکردنەوەیە بۆ قورئان ، ئیمامی محمد بن ادريس الشافعی فەرموویەتی: هەموو شتێك کە رسول اللَّه ﷺ حوکمی لەسەر دابێت ئەوا لەوەوەیە کە لە قورئانی وەرگرتووە .

جا خوێنەری بەڕێز بۆئەوەی بزانین وشەی الظالمون شێوە جیاوازەکانی تری بەکارهاتووی ئەم وشەیە بۆ چی مەبەست و بە چ مانایەك بەکارهاتووە لەم ئایەتە و ئایەتەکانی تری قورئانی پیرۆزدا:

خوێنەری بەڕیز وشەی الظالمون، لەو ئایەتەدا: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ مەبەست پێی کوفرە بەبەڵگەی قورئان لەزۆر جێگادا بێباوەڕان ناویان بە زاڵم هاتووە.

هەروەکو چۆن اللَّه دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ﴾ (يونس:١٠٦) واتا: هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێک یان شتێک لە جیاتی اللَّه تعالی کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمکارانیت. سەرنج بدە اللَّه تعالی لێرە "الظَّالِمِين" کردە "الكَافِرِين، المشركين" کوفری گەورەیە. باشە بۆچی ئایەتی سورەتی مائیدە وشەی "الكافرون" ئەکەن بە "الظالمين" سەیرە! لەکاتێکدا اللَّه تعالی ناوی زاڵمانی لێرە بەکوفرێکی دەرخەر لەدین هێناوە! هەروەها لەتەفسیری ئەو ئایەتە بە موشریکیش هاتووە: ﴿الظّالِمِينَ﴾ يَعْنِي: الْمُشْرِكِينَ. (تفسير ابن أبي حاتم (١٠٦٢٥).

وە اللَّه فەرموویەتی: ﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا ظَٰلِمِينَ﴾ (الأنفال :٥٤). واتا: ڕەوشتی ئەمانە هەر وەکو دابونەریتی دارودەستەی فیرعەون و ئەوانەی پێشیان وایە کە بەڵگە و فەرمانەکانی پەروەردگاریان بە درۆ دەزانی و باوەڕیان پێی نەبوو لە ئەنجامدا ئێمەش بە هۆی گوناهە و تاوانیانەوە لە

ناومان بردن و داروودەستەی فیر عەونیشیان نوقمی دەریا کرد هەموو شیان ستەمکاربوون.

سەرنج بدە اللَّه تعالی فیرعەونی بە چی ناوبردووە لە کاتێکدا کە فیرعەون دەیگوت من خوام بە ظالمین ناوی هێنا، کەواتە ئەو ظالمینە کوفرێکی دەرخەرە لەدین.

اللَّه دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَـٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَـٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ (البقرة:٥٤).

واتا: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ببەخشن لەو ڕۆزییەی کە پێمان داون پێش ئەوەی کە ڕۆژێ بێ کە نەکڕین و فرۆشتنی تێدایە و نە دۆستایەتی و ئاشنایەتی تێدایە وە نە تکای تێدایە تا ڕزگارتان کات لەسزا وە هەر بێ بڕوایانن ستەمکاران.

سەرنج بدە اللَّه تعالی فەرمووی: ﴿وَٱلْكَـٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ واتا: بێبڕواکان زاڵمن.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ﴾ (الأعراف: ١٤٨). واتا: وە هۆزی مووسا پاش ڕۆیشتنی مووسا دروستیان کرد لە خشڵ و زێڕەکانیان پەیکەری گوێرەکەیەك کە قۆڕەی وەك گوێرەکەی هەموو ئایا ئەوانە نەیان بینی کە بێگومان ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵ دا ناکات و هیچ ڕێبازێکیشیان نیشان نادات کردیان بە پەرستراو و ئەوانە ستەمکار بوون.

سەرنج بدە قەومەکەی هەڵساون بە پەرستنی بتێك لە زێڕ دروستکراوە لە هەمان کاتدا اللَّه تعالى پێیانی فەرموو: ﴿وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ﴾، ستەمکاربوون!

اللَّه تعالى فەرموویەتی: ﴿فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ۝ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ۝ فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (يونس: ٨٣ - ٨٤ - ٨٥ – ٨٦). واتا: جا لە سەرەتاوە بڕوای نەهێنابە مووسا چەند گەنجێ نەبێت لەگەڵەکەی بە هۆی ترس و بیمیان لە فیرعەون و پیاوماقوڵ و گەورەکانیان نەوەك بیان نگێڕێتەوە بۆ بێ دینی بەڕاستی فیرعەون خۆ بەزل زان و زاڵ بوو لە زەوی میسر دا وە بەڕاستی لە سنوور بەزێنان بوو ، مووسا وتی: ئەی گەلەکەم

گەر ئێوە بڕواتان بە اللَّه تعالی هێناوە ئەوە تەنها پشت بە اللَّه تعالی ببەستن ئەگەر ئێوە فەرمانبەر و ملکەچن، ئەوانیش باوەڕدارەکان وتیان: تەنها پشتمان بە خوای گەورە بە ستووە ئەی پەروەردگارمان مەمانگێڕە بە جێگەی ئەشکەنجە بۆ گەلی ستەمکاران وە ڕزگارمان بکە بە بەزەیف خۆت لە دەست کۆمەڵێ بێ بڕوایان.

جا ئەگەر سەرنج بدە فیرعەون و داروودەستەکەی بێ بڕوابوون بەڵام کاتێك ئەوانەی کە لەگەڵ موسا بوون علیه السلام پاڕانەوە لە اللَّه تعالی و گوتیان: ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ دوایش دەڵێن: ﴿وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، کەواتە قەومێکی بێباوەڕیان کرد بەزاڵم و زاڵمیش لێرە بێباوەڕ بوو.

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (هود : ١٨). واتا: ئایا کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە درۆ هەڵبەستێ بە ناوی اللَّه تعالی وە ؟ ئەوانە دەبرێنە حوزوری پەروەردگاریان ووتەکانیان دە خرێتە ڕوو وە شایەتەکان لە پێغەمبەران و فریشتەکان دەڵێن ئا ئەوانەن ئەو کەسانەن لە دونیادا درۆیان هەڵدەبەست بە ناوی پەروەردگاریانەوە بێداربن نەفرینی اللَّه تعالی بۆ ستەمکارانە.

سەرنج بدە ئەوانەی کە درۆ بەناوی اللَّه تعالی هەڵدەبەستن ناوی بردوون بە ٱلظَّٰلِمِينَ .

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ﴾ (هود: ٦٧). واتا: ئەوانەش کە ستەمیان کرد شریخەیەك گرتنی ئیتر لەناو ماڵەکانیاندا کەوتن بەڕوودا و جووڵەیان لێ بڕا واتا مردن.
پاشان اللَّه تعالی لە هەمان سورەت لە ئایەتی دواتردا فەرموویەتی: ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَآ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ﴾ (هود: ٦٨). واتا: وەك ئەوەی لەوێدا نەبووبن بێدار بن بەڕاستی ثەموودیەکان بێ بڕوابوون بە پەروەردگاریان بێداربن دووری و لەناوچوون بۆ ثەموودیەکان.
سەرنج بدە لە ئایەتی یەکەمدا پێیان دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ بەڵام لە ئایەتی دواتردا پێیان دەفەرمووێت: ﴿كَفَرُوا﴾

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (إبراهيم: ١٣).
واتا: بێ بڕواکان وتیان بە پێغەمبەرەکانیان بەڕاستی لە خاك و وڵاتەکەمان دەرتان دەکەین یان بەڕاستی دەبێ بگەڕێنەوە ناو ئاینەکەی ئێمە جا پەروەردگاریان نیگای بۆ پێغەمبەران کرد کە بێگومان ستەمکاران لە ناو دەبەین.

سەرنج بدە ئەوانەی کە کافربوون اللَّه تعالی ناوی بردوون بە: ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ (النحل: ١١٣). واتا: سوێند بە اللَّه تعالی بەڕاستی پێغەمبەرێکیان لە خۆیان بۆ هات کەچی باوەڕیان پێ نەهێنا جا سزا گرتنی لە کاتێکدا ستەم کار بوون.

سەرنج بدە کافربوون چونکە بڕوایان بە پێغەمبەرێك نەهێناوە بەڵام اللَّه تعالی ناوی بردوون بە: ﴿ظَٰلِمُونَ﴾.

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ وَجَعَلَ لَهُمۡ أَجَلٗا لَّا رَيۡبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا﴾ (الإسراء: ٩٩). واتا: ئایا ئەوانە نەیان زانیوە بێگومان ئەو اللَّه یەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە دەسەڵات دارو بەتوانایە کە وێنەی ئەوانە دروست بکات وە کات و ماوەیەکی دیاری کردووە بۆیان کە گومانی تێدا نی یە بەڵام ستەمکاران هیچیان ناوێت بێ باوەڕی نەبێت.

سەرنج بدە ئەوانەی کە بێ باوەڕیان هەڵبژارد و ویستیان، اللَّه تعالی ناوی بردوون بە: ﴿ٱلظَّٰلِمُونَ﴾.

اللَّه تعالى فەرموويەتی: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّيٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الأنبياء: ٢٩). واتا:وە هەر كام لەوانە فریشتەكان بڵێ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لە اللَّه تعالى ئەو بە ئاگری دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین هەر بەو جۆرە پاداشتی ستەمكاران دەدەینەوە تۆڵەیان لێ دەكەینەوە.

سەرنج بدە ئەو كەسەی بڵێت من اللَّه م اللَّه تعالى ناویانی بردووە بە: ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.

اللَّه تعالى فەرموويەتی: ﴿وَٱقْتَرَبَ ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبْصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَٰوَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ (الأنبياء: ٩٧). واتا: وە نزیك بۆتەوە بەڵێنی ڕاست هاتنی قیامەت جا لەناكاودا ئەبڵەق و زەق دەبێ چاوی ئەوانەی بێ بڕوا بوون دەڵێن هاوارو مەرگ بۆ ئێمە بێگومان ئێمە لە دنیادا لە بێ ئاگاییەكی تەواو دا بووین لە ئەمە نەخێر بەڵكو ئێمە ستەمكار بووین.

سەرنج بدە بەهەمان شێوە ئەوانەی كافربوون اللَّه تعالى ناوی بردوون بە: ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.

اللَّه تعالى فەرموويەتى: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا﴾ (الفرقان: ٤). واتا:ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون دەیان وت بێگومان ئەم قورئانە هیچ نییە جگە لە درۆیەکی گەورە کە محمد ﷺ هەڵی بەستووە وە کەسانی تر بۆ ئەو هەڵبەستنە یارمەتییان داوە ئەوە بەڕاستی ئەوانە ستەم و بوختانێکی گەورەیان کردووە.

اللَّه تعالى فەرموويەتى: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ (غافر: ٥٢). واتا: ڕۆژێك پاكانە كردنی بێ باوەڕان سوودیان پێ ناگەیەنێ هەموویان نەفرەتیان لێ كراوەو خراپترین جێگایان هەیە. سەرنج بدە اللَّه تعالى ڕوونی كردەوە ئەوانەی خراپترین جێگایان هەیە بریتین لە: ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان:١٣) واتا: بەڕاستی هاوەڵدانان بۆ الله زوڵمێكی گەورەیە.

جا عبداللە دەربارەی ئەو ئایەتە لە رسول اللّه ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ (الأنعام: ٨٢) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَقَالُوا: أَيُّنَا لَا يَظْلِمُ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:لَيْسَ هُوَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان: ١٣) (البخاري:٦٩٣٧).

واتا: عبداللە ی کوڕی مسعود کاتێ ئایەتی: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا﴾ واتا: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و ستەمیان تێکەڵ بە ئیمانیان نەکردووە. هاوەڵانی رسول اللّه ﷺ وتیان: جاکێمان هەیە ستەمی لەخۆی نەکردبێت؟ رسول اللّه ﷺ فەرمووی: (ئەوە بەوشێوە نییە کە ئێوە گومان دەبەن) بەڵکو، ئەمە وەك ئەوەیە کە (لقمان) بە کورەکەی خۆیی دەڵێت: کوڕی شیرینم هاوەڵ بۆ اللّه تعالی دامەنێ، چونکە هاوەڵ دانان ستەمێکی گەورەیە.

اللّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ﴾ (الأعراف:٩) واتا: ئەوانە کەسانێکن کە خۆیانیان دۆڕاندووە و زەرەرمەندبوون بەهۆی ئەوەی کە ستەمیان کرد بەرانبەر بەڵگە و نیشانەکانی ئێمە.

سەرنج بدە اللّه تعالی ئەوانەی کە زوڵم لە ئایەتەکانی دەکەن بەزاڵم ناوبردووە.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ (الأنعام: ٨٢) واتا: ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و زوڵمیان لە گەڵیدا تێکەڵ نەکردووە. جا ابن زمنين لەتەفسیری ئەو وشەی بِظُلْمٍ دەڵێ: ﴿إِيمانهم بظُلْمٍ﴾ بشرك. کەواتە بەهەمان شێوە زوڵم بەمانای شیرك هاتووە.

هەروەها عبدالرزاق لەتەفسیری ئەو ئایەتە قەولی قەتادە نەقڵ دەکات دەربارەی وشەی بِظُلْمٍ دەڵێ: عَنْ قَتَادَةَ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ الأنعام: ٨٢) قَالَ: بِشِرْكٍ واتا: قەتادە دەربارەی ئەو وشەی زوڵمە دەڵێ: شیرکە.

کەواتە ئەوە بەڵگەیە کەوا وشەی زوڵم زۆر جار بەمانای کوفر و شیرك دێت.

پاشان دێینە سەر وشەی الفاسقون, اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ بەهەمان شێوە مەبەست لە وشەی: ﴿ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ فیسقی گەورەیەو دەرخەرە لەدین و موراٍدفی کوفرە بەبەڵگە ی قورئان:

جا زانای وا هەیە ئەو فاسقونەی بە شیرك تەفسیر کردووە:

لەوانە ابن زمنين دەربارەی ئەو ئایەتەو وشەی: الْفَاسِقُونَ دەڵێ: ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ الْفسق هَا هُنَا: الشِّرْكُ. (تفسير ابن زمنين(ج:٢/ ٣١). واتا: وشەی فیس لێرەدا بەمانای شیرکە.

اللَّه تعالی ڕوونی کردۆتەوە کە بێباوەڕ فاسقەو فاسقێکی لەدین دەرخەرە هەروەکو چۆن فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ﴾ (البقرة: ٩٩). واتە: سوێند بێت بە اللَّه تعالی ئێمە بێگومان نیشانەو ئایەتی ڕوونمان بۆ تۆ ناردووە ئەی محمد کەس باوەڕی پێی لەق نابێت، جگە لە دەروون نەخۆش و یاخی بووەکان.
سەرنج بدە اللَّه تعالی ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوانەی کە کوفر دەکەن بە ئایەتەکانی اللَّه تعالی ناوی بردوون بە: ﴿فَاسِقُونَ﴾ .

اللَّه تعالى فەرموویەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾.(سورة النور: ٥٥). واتە: اللَّه تعالى بە لێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوە ڕیانهێناوە لەئێوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لەئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لەوڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووە و ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت اللَّه تعالى خۆی پێی ڕازیە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بەئارامی و هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بەتەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە تاوانبار و لەسنوور دەرچوون. جا سەرنج بدە ئەوەی کوفر بکات اللَّه تعالى بە (فَاسِقُونَ) ی ناوبردوون .

اللَّه تعالى فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا يَمَسُّهُمُ الْعَذَابُ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾.(سورة الأنعام: ٤٩).واتە: ئەوانەش کە بڕوایان نەهێنا بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، سزا و ئازار یەخەیان پێ دەگرێت و پێیاندا دەچزێت بەهۆی ئەوەیدەردەچوون لەفەرمانی اللَّه تعالى.

سەرنج بدە اللَّه تعالى ئەوانەی کە ئایەتەکانی اللَّه تعالی بەدرۆ دەخەنەوە کارەکەیانی ناو بردوون بە: يَفْسُقُونَ

اللَّه تعالى فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِوَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ﴾. (سورة التوبة: ٨٤) واتە: هیچ کات لەسەر هیچ کەس لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەڕاستی ئەوانە باوەڕیان بە اللَّه تعالى و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو و مردیشن لەکاتێکدا لە دین دەرچوو بوون.
سەرنج بدە اللَّه تعالى ئەوانەی کە کافربوون بە اللَّه تعالی پاشان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ناوی بردوون بە: فَاسِقُونَ

اللَّه تعالى فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَفَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾. (سورة يونس: ٣٣) واتە: ئا بەو شێوەیە (چونکە لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەیەدا هەر تاوانبارن و سەر کەشی دەکەن) بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئەوانەی کە لەسنوور دەرچوون بڕاوەتەوە، کە ئەوانە بەڕاستی هەرئیمان و باوەڕناهێنن.
سەرنج بدە اللَّه تعالى ئەوانەی کەئیمان ناهێنن ناوی بردوون بە: فَسَقُوا

اللَّه تعالی کە شەریکی بۆ نییە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾.(سورة الكهف: ٥٠ ). واتە: ئێمە کاتێك بەفریشتەکانمان وت سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەر هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە لەدەستەی پەریەکان بوو بەهۆی ئەوەوە لە فەرمانی پەروەردگاری یاخی بوو، ئایا ڕەوایە کە ئەو و نەوەکەی بکەنە پاڵپشت و یار و یاوەری خۆتان لە جیاتی من، لەحاڵێکدا ئەوان دوژمنی هەمیشەیی ئێوەن، ئای کە چەندە کارێکی خراپ و ناڕەوایە بۆ ستەمکاران کە لە جیاتی اللَّه تعالی دوژمنێکی وەك شەیتانیان داناوە و گوێڕایەڵی دەکەن.

سەرنج بدە هەتاوەك اللَّه تعالی دەرچوونەکەی شەیتانی سەرگەورەی کافرانی بە (فَسَقَ) ناوبردووە .

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ فِي تِسْعِ آيَاتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾.(سورة النمل: ١٢).

واتە:جا دەستەکەت بخەرە گیرفانتەوە، هەر کە دەرتهێنا بە سپییەکی بێ عەیب دێتە دەرەوە، ئەم دوو موعجیزە یە لە ڕیزی نۆ موعجیزە دایە بۆ فیرعەون و قەومەکەی، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی لە سنوور دەرچوو بوون. سەرنج بدە اللَّه تعالی قەومی نوح کە کافر بوون بە ﴿فَاسِقِينَ﴾ ناوی بردوون.

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ .(سورة السجدة: ٢٠). واتە: ئەوانەش تاوانبار یاخی بوون، شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، هەر کاتێك ویستیان لێی دەرچن، دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی، پێیان دەوترێت: بچێژن سزای ئەو ئاگرەی کە بڕواتان پێی نەبوو.

سەرنج بدە بەهەمان شێوە اللَّه تعالی کافرانی بە فاسق ناو بردووە.

اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾.(سورة الذاريات: ٤٦). واتە: پێشتریش هۆزی نوح بەڕاستی هەر تاوانبار و خوانەناس و لار و وێربوون ئەوانیشمان بە زریانەکە لەناوبرد.

سەرنج بدە اللَّه تعالی قەومی نوح کە کافر بوون بە (فَاسِقِينَ) ناوی بردوون

بۆت ڕوون بوویەوە کە هەرسێ وشەی: الكافِرُونَ، الظّالِمُونَ، الفاسِقُونَ، مەبەست پێی کوفرو زوڵمی گەورەیە، هەروەها محمد الأمين الشنقيطي دە ڵێ: (في هَذا البَحْث أنَّ الكُفْرَ، والظُّلْمَ، والفِسْقَ، كُلُّ واحد منها رُبَّما أُطْلِقَ في الشَّرْعِ مُرادًا بِهِ المَعْصِيَةُ تارَةً، والكُفْرَ المُخْرِجَ مِنَ المِلَّة أُخْرى: ﴿وَمَن لَمْ يَحْكم بما أنْزَلَ اللَّهُ﴾، مُعارَضَةً لِلرُّسُلِ وإبْطالًا لِأحْكام اللَّه، فَظُلْمُهُ وفِسْقُهُ وكُفْرُهُ كُلُّها كُفْرٌ مُخْرِجٌ عَنِ المِلَّة). واتا: لەو گەڕانەدا کوفر و زوڵم و فیسق، هەموو ئەوانە لەوانەیە جارێك لەشەرعدا مەبەست پێی مەعصیەت بێت، وە لەوانە یە مەبەستیش پێی کوفرێکی دەرخەر بێت لەئیسلام، هەرکەسێک حوکم نەکات بەوەی اللَّه تعالى دایبەزاندوە بەبەربەکانێکردن لەگەڵ پێغەمبەران و بەتاڵکردنەوەی حوکمەکانی اللَّه تعالى ئەوا ستەمەکەی و فسقەکەی و کوفرەکەی هەموی لەئیسلام دەریدەکات .

## وەڵامی چەند شوبهەیەك:

یەکەم: بانگەشەی ئەوەی کەوا ستەکردن لەحوکم کوفری بچووکەو ئیجماعی لەسەرە:

دەڵێن ئەوەتا ابن عبد البر فەرموویەتی: (وأجمع العلماء على أن الجور في الحكم من الكبائر لمن تعمدذلك عالمًا به) (التمهيد ٣٥٨/١٦). واتا: زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کەسێ ستەم بکات لە حوکمدا، ئەوە تاوانی گەورەیە ئەنجامداوە بەڵام بۆ کەسێ کە بە عەمدی حوکمەکە بکات و عیلمی هەبێ بەوکارەی کە مخالفی شەریعەتە.

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەوە یەکێکە لە فێڵ و تەدلیسەکان، وە لە ئەهلی عیلم و مەعریفە بە وتەی زانایانی سەلەف ون نابێت، جا لێرەدا وا نیشان دەدەن کەوا سەلەفی پێشین لەسەر یەك وتەن دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ پێیان وایە کوفرێکی دەرخەر نییە لە میللەت !

لە ڕاستیدا ئەوە یەکێکە لەتەلبیسەکانیان، چونکە لەلای کەسێکی عامیش ون نابێت، چجای ئەوەی بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەهلی عیلمە، چاك دەزانێ دەربارەی ئەو ئایەتە زانایان ڕایان جیایە، جا بۆ ئەوەی ئەو بانگەشە یان بەتاڵکەینەوە وتەی هەندێك لەئەهلی عیلم و زانایان دەخەینە ڕوو:

یەکەم: شیخ المفسرین ئیمامي طەبەڕی دەربارەی ئەو ئایەتەو وشەی کوفر لەو ئایەتە دەڵێ: (وَقَدِ اخْتَلَفَ أَهْلُ التَّأْوِيلِ فِي تَأْوِيلِ "الْكُفْرِ" فِي هَذَا الْمَوْضِعِ).تفسير الطبري (ج:١٠/ ٣٤٧) واتا: ئەهلی تەئویل لەتەئویلی وشەی کوفر لەو شوێنە ڕا جیایی و ئیختیلافیان هەیە.
جا سەرنج بدە گەورە موفەسیرێکی وەکو ئیمامی طەبەڕی دەڵێ ئیختیلاف هەیە دەربارەی کوفری ئەو ئایەتە ئایە بچوکە یان گەورەیە، جا ئایە ئێوە لەو زاناترن بە تەفسیری ئایەتەکان و وتەی سەلەف؟ یاخود ئەویشتان پێ خەواریجەو هەڵەیە ؟!

دووەم: ئیمامی ابن کثیر دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ دەڵێ: (فيه قولان سيأتي بيانهما) (تفسير بن كثير ج: ٢ ص: ٦١) واتا: دوو ڕا هەیە بەیان و ڕوونکردنەوەکەی دواتر دێت.

پاشان ابن کثير دەربارەی ئەو دوو ڕایە کە یەکەمیان بەکوفری گەورە و دەرچوون لە میللەتی دادەنێ و ئەثەرکەی ابن مەسعود دەکاتە بەڵگە، دەڵێ: یەکەمیان: (وقال ابن جرير أيضا حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ ، قَالَ : ثنا هُشَيْمٌ، قَالَ : أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْمَلك بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْل ، عَنْ عَلْقَمَةَ ، وَمَسْرُوق أَنَّهُمَا سَأَلا ابْنَ مَسْعُود عَنِ الرِّشْوَة ، فَقَالَ : منَ السُّحْت . قَالَ : فَقَالا: أَفِي الْحُكْمِ ؟ قَالَ : ذَاكَ الْكُفْرُ . ثُمَّ تَلا هَذه الآيَةَ : ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ وقال السدي ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ يقول: ومن لم يحكم بما أنزلت فتركه عمدا أو جار وهو يعلم فهو من الكافرين). واتا: يعقوب بن ابراهيم بۆی باسکردین فەرمووی: هشيم بۆی باسکردین، عبدالملك بن أبي سلمان پێمانی گوت، لە سلمة بن کوهەیلەوە لە عقلمە و مسروقەوە، پسیاریان کردووە لە ابن مسعود دەربارەی سوو ڕیشوە ، فەرموویەتی: بریتیە لە سحت، (حرام) وتیان ئەی لە حوکمدا؟، فەرمووی: ئەویان کوفرە، دوای ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللَّە تعالی دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن. سودی دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە اللَّە تعالی دایبەزاندووە، ئا ئەوانە کافرن، دەڵێ: اللَّە تعالی فەرموویەتی: کەسێك حوکم بەوە نەکات کە دامبەزاندووە بەعەمدەن وازی لێبێنێ، بشزانێ ئەوە لەبێباوەڕانە.

سەرنج بدە ابن کثیر سەرەتا گوتی دوو ڕا هەیە دەربارەی ئەو ئایەتە ئەوەش ئەو ئیجماعەی کە بەهەڵە لێی تێگەیشتون بەتاڵ دەکاتەوە، پاشان لەدەربارە ی ڕای یەکەم ئیستدلالی بە ئەثەرکەی ابن مەسعود کرد کە دەڵێ ڕیشوە لەحوکمدا کوفرە، جا ئێمە لەوانە دەپرسین کە پێیان وایە کوفری دەرخەر نییە لەدین: ئایە ابن کەثیر خەواریجە ؟ چونکە ڕاستەخۆ ئاماژەی بە ئەثەرکەی ابن مەسعود کرد کە دەڵێ کوفرە. جا ئەوە خۆی لەخۆیدا وەڵامێکە بۆ ئەوانەی کەوا دەڵێن ابن بطة ئەو ئەثەرەی لەژێر ناو نیشانی ئەو شتانە داناوە کە لەدینی دەرناکات.

دووەمیان: ابن کەثیر لەڕای دووەم ئیستدلال بەئەثەرە زەعیفەکەی کە دراوە پاڵ ابن عباس دەکات: (وقال علي بن أبي طلحة عن ابن عباس قوله ﴿ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون﴾ قال من جحد ما أنزل الله فقد كفر ومن أقربه فهو ظالم فاسق) تفسير ابن كثير (ج: ٢ ص: ٦٢). واتا: علي بن أبي طلحة لە ابن عباسەوە وتەی هەر کەسێك حوکم بەوە نەکات کە اللّٰه تعالی دایبەزاندووە ئەوانە لە بێباوەڕانن، دەڵێ: هەرکەسێك نکوڵی بکات لەوەی کە اللّٰه تعالی دایبەزاندووە، ئەوە بێباوەڕە، کەسێکیش دانی پێدا بنێت ئەوە زاڵم و فاسقە.

جا سەرنج بدە وتەکەی ابن کثیر گوتی: دوو ڕا هەیە دەربارەی ئەو ئایەتەو ئاماژەی بە وتەی سەلەف دا کە بریتی بوون لەصەحابەی بەڕێز، ئەو زەعمەو نیشان دانەی ئەوانەی بانگشەی ئیجماعی سەلەف دەکەن لەسەر ئەوەی یەك وتە هەیە ئەوەشی پوچەڵ کردەوە.

سێیەم: شیخ الإسلام دەڵێ: (وَالْإِنْسَانُ مَتَى حَلَّلَ الْحرَامَ - الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ - أَوْ حَرَّمَ الْحَلَالَ - الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ - أَوْ بَدَّلَ الشَّرْعَ - الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ - كَانَ كَافِرًا مُرْتَدًّا بِاتِّفَاقِ الْفُقَهَاءِ. وَفِي مِثْلِ هَذَا نَزَلَ قَوْلُهُ عَلَى أَحَدِ الْقَوْلَيْنِ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ أَيْ هُوَ الْمُسْتَحِلُّ لِلْحُكْمِ بِغَيْرِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ) (مجموع الفتاوى (٣/٢٦٧). واتا: مرۆڤ هەرکاتێک شتێکی حەڵاڵی حەڕام کرد کە کۆدەنگی هەیە لەسەر حەڵاڵیەتی، یان حەرامێکی حەڵاڵ کرد کە کۆدەنگی هەیە لەسەر حەڕامیەتی، یان شتێکی لە دینی ئیسلام گۆڕی کە کۆدەنگی هەیە سەری، ئەوە ئەوکەسە کافرە بە کۆدەنگی هەموو شەرع زانان، وەلەهاوشێوەی ئەمەدا وتەکەی اللَّه تعالى دائەبەزێتە سەری یەکێ لەوتەکان کە اللَّه تعالى فەرمویەتی: هەرکەسێك حوکم نەکات بەوەی اللَّه تعالى دایبەزاندوە ئائەوانە بێ باوەڕن، واتا: ئەوکەسە حەڵاڵی کرد حوکم بکات بەغەیری ماانزل اللَّه.

جا سەرنج بدە زۆربەیان ئەو بەشەی وتەکەی ابن تیمیە دەبڕن و نایهێننەوە کەدەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: عَلَى أَحَدِ الْقَوْلَيْنِ واتا: دوو وتە هەیە دەربارە ی ئەو ئایەتە، بەمەش ئەو وتەیەی کەدەڵێ سەلەف لەسەر یەك وتە بووینە لەدربارەی ئەو ئایەتە بەتاڵ دەکاتەوە.

چوارەم: ابن الجوزي باسی ئەو ئایەتە دەکات: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ جا دەڵێ: (وفي المراد بالكفر المذكور في الآية الأولى قولان :أحدهما : أنه الكفر بالله تعالى . والثاني : أنه الكفر بذلك الحكم وليس بكفر ينقل عن الملة). (زاد المسير ج: ٢ ص: ٣٦٦). واتا: مەبەست لە وشەی کوفری باسکراوی ئەو ئایەتە دوو ڕا هەیە: یەکەمیان: مەبەست پێی کوفرە بە اللّٰه دووەمیان: ئەو کوفرە لەدەربارەی حوکمە و لەدین دەرخەر نییە.

سەرنج بدە ئەوەش ئەو وتەیە بەتاڵ دەکاتەوە کە دەڵێ سەلەف لەدەربارەی ئەو وتە لەسەر یەك ڕابوونەو وەڵامێکە بۆ ئەو تەدلیسچیانەی کەوا وتە یەکی ابن الجوزی دەهێنن موافقی خۆیانەو واز لەوتەیەکی تری دێنن !جا ئەوە بەڕوونی دیارە کە دەڵی وتەی یەکەم مەبەست لەو کوفرە کوفرکرنە بە اللّٰه تعالی چونکە حوکمی اللّٰه تعالی ی پەك خستووە پەنا بە اللّٰه تعالی.

پێنجەم: ابن القيم دەربارەی ئەو ئایتە شەش بۆچوون دەهێنێتەوە! وە وەڵامێکی بۆ ئەوانەش تێدایە کە وازیان لەو قسەی ابن القيم هێناوەو وتەکەی تری دەکەن بەبەڵگە ئەوەش یەکێکە لەتەدلیسەکان!

جا ابن القيم دەڵێ:

یەکەم: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ المائدة: ٤٤) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَيْسَ بِكُفْرٍ يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ، بَلْ إِذَا فَعَلَهُ فَهُوَ بِهِ كُفْرٌ، وَلَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَكَذَلِكَ قَالَ طَاوُسٌ، وَقَالَ عَطَاءٌ: هُوَ كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ، وَظُلْمٌ دُونَ ظُلْمٍ، وَفِسْقٌ دُونَ فِسْقٍ) واتا: هەرکەسێك حوکم بەوە نەکات کە اللَّه تعالى دایبەزاندووە ئەوانە بێباوەڕن، ابن عباس دەڵێ: کوفرێکی دەرخەر نییە لەمیللەت، بەڵکو پێی کافر دەبێ بەڵام وەکو کەسێك نییە کوفر بکات بە اللَّه تعالى و بەرۆژی دوای، بەهەمان شێوە طاوسیش وادە لێ، عەطا دەڵێ کوفرێکە لەخوار کوفر،زوڵمێکە لەخوار زوڵم، فیسقێکە لەخوار فیسق.

دووەم: (مِنْهُمْ مَنْ تَأَوَّلَ الْآيَةَ عَلَى تَرْكِ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ جَاحِدًا لَهُ، وَهُوَ قَوْلُ عِكْرِمَةَ، وَهُوَ تَأْوِيلٌ مَرْجُوحٌ، فَإِنَّ نَفْسَ جُحُودِهِ كُفْرٌ، سَوَاءٌ حَكَمَ أَوْ لَمْ يَحْكُمْ). واتا: هەیە ئەو ئایتەی بەتەرکردنی حوکم بەنکوڵیەوە تەئویل کردووە، ئەوەش وتەی عیکریمەیە، ئەوەش تەئویلێکی ڕاجحە، وە خودی نکوڵی کوفرە، جا چ حوکمی پێ بکات یان پێی نەکات.

سێیەم: (وَمِنْهُمْ مَنْ تَأَوَّلَهَا عَلَى تَرْكِ الْحُكْمِ بِجَمِيعِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ، قَالَ: وَيَدْخُلُ فِي ذَلِكَ الْحُكْمُ بِالتَّوْحِيدِ وَالْإِسْلَامِ، وَهَذَا تَأْوِيلُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْكِنَانِيِّ، وَهُوَ أَيْضًا بَعِيدٌ، إِذِ الْوَعِيدُ عَلَى نَفْيِ الْحُكْمِ بِالْمُنَزَّلِ، وَهُوَ يَتَنَاوَلُ تَعْطِيلَ الْحُكْمِ بِجَمِيعِهِ وَبِبَعْضِهِ. واتا: هەیە بەتەرك كردنی بەهەموو ئەو حوكمانەی كە اللَّه تعالى دایبەزاندووە تەئویلی بۆ كردووە بەمەش حوكم كردن بەتەوحیدو ئیسلامیش دەگرێتەوە، ئەوە تەئویلی عَبْدِالْعَزِيزِ الْكِنَانِيِّ ـیە ئەوەش بەهەمان شێوە دوورە، چونكە وەعیدەكە لەسەر رەتكردنەوەی حوكمی دابەزێنراوە، ئەوەش پەكخستنی هەموو حوكمەكە یان بەشێكی دەگرێتەوە. ئەوەش وەڵامێكە بۆ ئەوانەی كە وتەكەی ابن القيم دەكەن بەبەڵگە ئەوەتا لێرە ئەو بۆچوونەش بەدوور دەزانێ كەسێك تەركی تەواوی حوكم بكات و بانگشەی موسوڵمانێتی بكات.

چوارەم: (وَمِنْهُمْ مَنْ تَأَوَّلَهَا عَلَى الْحُكْمِ بِمُخَالَفَةِ النَّصِّ، تَعَمُّدًا مِنْ غَيْرِ جَهْلٍ بِهِ وَلَا خَطَأٍ فِي التَّأْوِيلِ، حَكَاهُ الْبَغَوِيُّ عَنِ الْعُلَمَاءِ عُمُومًا). واتا: هەیە بە حوكم كردن بەپێچەوانەی دەق بە ئەنقەست تەئویلی كردووە، بەبێ نەزانین بەحوكمەكەو هەڵەكردن لەتەئویل، بەغەوی ئەوەی لەزانایان گێڕاوەتەوە بەگشتی.

پێنجەم: (وَمِنْهُمْ مَنْ تَأَوَّلَهَا عَلَى أَهْلِ الْكِتَابِ، وَهُوَ قَوْلُ قَتَادَةَ، وَالضَّحَاكِ وَغَيْرِهِمَا، وَهُوَ بَعِيدٌ، وَهُوَ خِلَافُ ظَاهِرِ اللَّفْظِ. فَلَا يُصَارُ إِلَيْهِ) واتا: هەیە لە دەربارەی ئەهلی کیتاب تەئویلی کردووە، ئەوەش وتەی قەتادەو ضەحاك و غەیری ئەوانیشە، ئەوەش دوورەو پێچەوانەی زاهیری لەفزەکەیەو لای لێناکرێتەوە.

شەشەم: (وَمِنْهُمْ مَنْ جَعَلَهُ كُفْرًا يَنْقُلُ عَنِ الْمِلَّةِ) واتا: هەیە ئەو ئایەتەی بە کوفری گەورە داناوە. جا ئایە ئەوانەی ئەو ئایەتە بەکوفری گەورە دەزانن خەواریجن؟! ئەوانەی مەقتەعێك لەوتەی ابن القیم دێنن کە موافقی ڕەئی خۆیانە و واز لەو جۆرانە دەهێنن با تەقوای اللّٰه تعالی ـیان هەبێ.

جا ابن القیم ڕوونی دەکاتەوە کە لەچ کاتێك کوفری گەورەو لەچ کاتێك کوفری بچووکە دوای ئەوەی کە ئەو وتانە نەقڵ دەکات ڕاستەوخۆ وتەی ڕاجح و دروست هەڵدەبژێرێ و دەڵێ: (وَالصَّحِيحُ أَنَّ الْحُكْمَ بِغَيْرِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ يَتَنَاوَلُ الْكُفْرَيْنِ، الْأَصْغَرَ وَالْأَكْبَرَ بِحَسَبِ حَالِ الْحَاكِمِ، فَإِنَّهُ إِنِ اعْتَقَدَ وُجُوبَ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِي هَذِهِ الْوَاقِعَةِ ، وَعَدَلَ عَنْهُ عِصْيَانًا، مَعَ اعْتِرَافِهِ بِأَنَّهُ مُسْتَحِقٌّ لِلْعُقُوبَةِ، فَهَذَا كُفْرٌ أَصْغَرُ، وَإِنِ اعْتَقَدَ أَنَّهُ غَيْرُ وَاجِبٍ، وَأَنَّهُ مُخَيَّرٌ فِيهِ، مَعَ تَيَقُّنِهِ أَنَّهُ حُكْمُ اللَّهِ، فَهَذَا كُفْرٌ أَكْبَرُ، وَإِنْ جَهِلَهُ وَأَخْطَأَهُ فَهَذَا مُخْطِئٌ، لَهُ حُكْمُ الْمُخْطِئِينَ). واتا: وتەی ڕاست و دروست ئەوەیە حوکم نەکردن بەوەی

کە اللَّه تعالیدایبەزاندووە، دوو کوفر لەخۆ دەگرێت، کوفری بچوك و گەورە، بەگوێرەی حاڵی حاکمەکە، جا ئەگەر حاکمەکە بیروباوەڕی وابوو کە حوکم کرد بەقورئان واجبە لەو ڕووداوە (واتا: لەقەزیەکی دیاری کراو) بەڵام لەوحوکمە بەمەعصیەتەوە لایدا، لەگەڵ داننان بەوەی کە شایستەی سزایە، ئەوە کوفری بچووکە، بەڵام ئەگەر بیروباوەڕی وابوو کە واجب نییە حوکم بەقورئان بکات لەو قەزیەدا و ئازادە لەو حوکمدانەی لەسەری و یەقینیشی وابوو کە حوکمی اللَّه تعالی یە ئەوە کوفری گەورەیە، وە ئەگەر نەزان بوو و هەڵەی کرد ئەوە هەڵەیە، حوکمی هەڵەکارانی هەیە.

جا جوان سەرنجی وتەکەی ابن القیم بدەن باسی قەزیەکی دیاری کراو دەکات نەك تەواوی حوکم کاتێك گوتی: (فِي هَذِهِ الْوَاقِعَةِ) واتا: لەو ڕووداوەی کە کەوتۆتەوە قەزیەکی دیاری کراوە، جا ئەگەر لایدا لەگەڵ ئیعترافکردنی بەوەی کەهەڵەیەو شایستەی سزایە ئەوە کوفری بچووکە ئەگەریش پێی وانەبوو واجبەو لەو قەزیە دیاری کراوە لایدا و پێی وابوو ئازادە ئەوە کوفری گەورەیە، جا ئەوە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن گەر تەرکی هەموو حوکم بکات و ئیستحلالی نەکات کوفری بچووکە !

جا ئەوە بۆچوونی ئەهلی عیلمە لەزانایان کە دان بەوە دادەنێن کە خیلاف هەیە لەنێو زانایانی سەلەف و ئەوانەی دوای ئەوان دێن دەربارەی ئەو ئایەتە جا چۆن کەسێك بانگەشەی ئیجماع دەکات لەو مەسەلەیە، چجای ئەوەی کە بڵێ ئەوەی پێچەوانەی ئەوە بکات خەواریجە !! پەنا دەگرین بە اللَّه تعالی لەو گومڕاییە.

وە دەربارەی ئەو ئیجماعەی عبدالبر هێناویەتەوە ئەوە لەسەر زاهیریەکە یەتی، بەبێ هیچ تەحریف و تەئویلێك، ستەمکردن لەحوکم شێوازێکە لەشێوازەکانی حوکم کردن بەغەیری ئەوەی اللَّه تعالیدایبەزاندووە، جیاوازە لە شێوازی تەشریع و حوکم کردن بەو تەشریعە، نەك پەکخستن و لەکارخستنی تەواوی حوکمە شەرعیەکان ! گومانی تێدا نییە کە دان بەوە دادەنێین کە ستەم لەحوکمدا لەگوناهە گەورەکانە، بەڵام کەسێك پێی وابێ ستەم لەتەواوی حوکمە شەرعیەکان بریتیبێ لە گوناهی گەورە ئەوە باتڵە، چونکە گەر وابێ هیچ مانایەك بۆ حوکمی اللَّه تعالینامێنێتەوە !

## ئەو کوفر دونە کوفرە کێ دەیکاتە بەڵگە ؟

أحمد محمد شاکر دەربارەی ئەوانەی ئەو ئەثەرە دەکەنە بەڵگە دەڵێ: (وهذه الآثار -عن ابن عباس وغيره- مما يلعب به المضللون في عصرنا هذا، من المنتسبين للعلم، ومن غيرهم من الجرآء على الدين: يجعلونها عذرا أو إباحة للقوانين الوثنية الموضوعة التي ضربت على بلاد الإسلام) تفسير ابن كثير (٦٢/٢) (عمدة التفسير (٤/ ١٥٦ - ١٥٨)) واتا: ئەو ئاثارانەی دەربارەی ابن عباس و غەیری ویش کە گومڕاکان یاری پێدەکەن لەو عەصرەی ئێستادا، لەوانەی کە خۆیان دایتە پاڵ عیلم و غەیری ئەوانیش کە جورئەتیان کردووە لەسەر دین، ئەو ئەثەرە دەکەنە بەڵگە بۆ ڕێگەدان بەیاسای دەستکردی بتپەرستی و دانراو کە وڵاتی موسوڵمانانی گرتۆتەوە.

جا براکەی شاکر محمود محمد شاکر دەڵێ: (اللهم إني أبرأ إليك من الضلالة. وبعد، فإن أهل الريب والفتن ممن تصدروا للكلام في زماننا هذا، قد تلمس المعذرة لأهل السلطان في ترك الحكم بما أنزل الله، وفي القضاء في الدماء والأعراض والأموال بغير شريعة الله التي أنزلها في كتابه، وفي اتخاذهم قانون أهل الكفر شريعة في بلاد الإسلام). (حكم الجاهلية(ص:٤١). واتا: پەروەردگارە من بەریم لەگومڕایی، دوای ئەوە بەڕاستی ئەهلی گومان و فیتنە ئەوانەی کە وتەیان لێدەردەچێ لەوزەمنەی ئێمە، عوزر بۆ سوڵتانەکان دەهێننەوە دەربارەی تەرك کردنی حوکم کردن بەوەی اللَّە تعالی دایبەزاندووە، لەجێبەجێ کردنی خوێن باییەکان و ئەعراض و ماڵ و سامان بەبێ جێبەجێ کردنی ئەو شەریعەتەی کە اللَّە تعالی دایبەزاندووە، وە جێ بەجێکردنیان بۆ قانونی بێباوەڕی لەوڵاتی موسوڵمانان.

جا بزانە خوێنەری بەڕیز جیاوازی هەیە لەنێوان تەرکی حوکم کردن بەتەواوی شەرعی اللَّە و حوکم کردن بەغەیری ئەوەی اللَّە تعالی دایبەزاندووە، ئەوەی دووەم حوکم کردن بەغەیری ئەوەی اللَّە تعالی دایبەزاندووە کوفری صەڕیحە بێگومان، ئەوەی دەمێنێتەوە کە بزانی تەرکی حوکم لەچ حاڵەتێك کوفری بچووکەو لەچ حاڵەتێکیش کوفری گەورەیە جا زانایان ئەوەیان ڕوونکردۆتەوە وەکو لەپێشووش ئاماژەمان بەوتەکەی ابن القیم دا.

ئێستاش ئاماژە بەوتەی چەند زانایەکی تر دەکەین:

## سەبارەت بەتەبدیل و گۆڕینی شەرعی اللَّه تعالى یان ڕەتکردنەوەی:

کۆدەنگی زانایان هەیە ئەگەر کەسێك شتێك لەحوکم و شەرعی اللَّه تعالى ڕەتبکاتەوە و دووری بخاتەوە پێی لەدین دەردەچێت: اسحاق بن راهویە دە لێ: (وَقَدْ أَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ أَنَّ مَنْ سَبَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَوْ سَبَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْ دَفَعَ شَيْئًا أَنْزَلَهُ اللَّهُ، وَهُوَ مَعَ ذَلِكَ مُقِرٌّ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ أَنَّهُ كَافِرٌ) (التمهيد لابن عبد البر(٤/٢٢٦) واتا: هەموو زانایان لەسەر کۆدەنگن کە هەرکەسێک جوێن بە اللَّه تعالى بدات یان بەپێغەمبەر ﷺ بدات، یانیش شتێک دووربخاتەوە کە اللَّه تعالى دایبەزاندووە وەلەگەڵ ئەوەش دان بەوە بنێ کە اللَّه تعالى دایبەزاندووە ئەوە بێ باوەڕە.

جا سەرنج بدە دەڵێ ئەگەرچی دانیشی پێدا بنێ نەك بە حەڵاڵی بزانێ حوکم بەغەیری قورئان بکات، بەڵکو بەس ڕەتی بکاتەوە پێی لەدین دەچێتە دەرەوە!! جا ئەو دەفعکردنە کە بەمانای رەتکردنەوەو دوورخستنەوە دێت بەمانای تەرککردنیش دێت !

ابن تيمية ئيجماع نەقڵ دەكات و دەڵێ: (وَمَعْلُومٌ بِالاضْطِرَارِ مِنْ دِينِ الْمُسْلِمِينَ وَبِاتِّفَاقِ جَمِيعِ الْمُسْلِمِينَ أَنَّ مَنْ سَوَّغَ اتِّبَاعَ غَيْرِ دِينِ الْإِسْلَامِ أَوْ اتِّبَاعَ شَرِيعَةٍ غَيْرِ شَرِيعَةِ مُحَمَّدٍ ﷺ فَهُوَ كَافِرٌ وَهُوَ كَكُفْرِ مَنْ آمَنَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَكَفَرَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ) (مجموع الفتاوى: (٢٨/٥٢٤). واتا: شتێكی بەپێویست زانراوە لەدینی موسڵمانان و بەیەكدەنگی هەموو موسڵمانان ئەوەی ڕێگابدات بە شوێنكەوتنی جگە لەدینی ئیسلام، یاخود شوێنكەوتنی شەریعەتێك جگە لەشەریعەتی محمد ﷺ ، ئەوا كافرە ، وەك كوفری ئەو كەسە وایە كە بڕوای بەهەندێك لەقورئان هەبێت و كوفریش بكات بەهەندێكی.

هەروەها ابن تيمية دەڵێ: (وَمَعْلُومٌ أَنَّ مَنْ أَسْقَطَ الْأَمْرَ وَالنَّهْيَ الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ بِهِ رُسُلَهُ فَهُوَ كَافِرٌ بِاتِّفَاقِ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ وَالنَّصَارَى) (مجموع الفتاوى: (٨/١٠٦)). واتا: شتێكی زانراوە كە هەركەسێك فەرمان و ڕێگرییـەكان لە كاربخات كە اللَّه تعالى پێغەمبەری پێ ڕەوانەكردووە ئەوا ئەو كەسە بێباوەرە بەیەكدەنگی موسڵمانان و جولەكە و گاورەكان.

ابن تيمية دەڵێ: (وَالْحُكْمُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ هُوَ عَدْلٌ خَاصٌّ، وَهُوَ أَكْمَلُ أَنْوَاعِ الْعَدْلِ وَأَحْسَنُهَا، وَالْحُكْمُ بِهِ وَاجِبٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَكُلِّ مَن اتَّبَعَهُ، وَمَنْ لَمْ يَلْتَزِمْ حُكْمَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهُوَ كَافِرٌ). (منهاج السنة ج ١٣١/٥). واتا: حوكمكردن بەوەی اللَّه تعالى دايبەزاندوە بۆسەر محمد ﷺ ئەوە دادوەری تەواوە و ە كاملترين جۆری دادوەريە و باشترينە وە وەحوكم پێكردنی واجبە لەسەر پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەشی شوێنی كەوتون وەهەركەسێ پابەندنەبێت بەحوكمی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەوا بێباوەرە.

هەروەها ابن تيمية دەربارەی ئەو ئايەتە: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ دەڵێ: فَكُلُّ مَنْ خَرَجَ عَنْ سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَشَرِيعَتِهِ فَقَدْ أَقْسَمَ اللَّهُ بِنَفْسِهِ الْمُقَدَّسَةِ أَنَّهُ لَا يُؤْمِنُ حَتَّى يَرْضَى بِحُكْمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جَمِيعِ مَا يَشْجُرُ بَيْنَهُمْ مِنْ أُمُورِ الدِّينِ وَالدُّنْيَا وَحَتَّى لَا يَبْقَى فِي قُلُوبِهِمْ حَرَجٌ مِنْ حُكْمِهِ). (مجموع الفتاوى (٤٧١/٢٨). واتا: هەركەسێک دەربچێت لەسونەتی رسول اللَّه ﷺ و ياساكەی ئەوا اللَّه تعالى سوێندی بەنەفسی پيرۆزی خۆی خواردوە كەئەوكەسە باوەڕی نييە تاكو ڕازی دەبێت بەحوكمی رسول اللَّه ﷺ لەهەموو كێشەيەكدا كەڕوودەدات لەنێوانياندا ئيتر چ كێشەی دونيای بێت يان دينی بيت، هەتا هيچ حەرەجێك لەدڵيان نامێنێ دەربارەی حوكمی اللَّه تعالى.

هەروەها ابن تيمية دەڵێ: (كَثِيرٌ مِنَ الْمُنْتَسِبِينَ إِلَى الْإِسْلَامِ يَحْكُمُونَ بِعَادَاتِهِمُ الَّتِي لَمْ يُنْزِلْهَا اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى، كَسَوَالِفِ الْبَادِيَةِ، وَكَأَوَامِرِ الْمُطَاعِينَ فِيهِمْ، وَيَرَوْنَ أَنَّ هَذَا هُوَ الَّذِي يَنْبَغِي الْحُكْمُ بِهِ دُونَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَهَذَا هُوَ الْكُفْرُ). (منهاج السنة النبوية (١٣٠/٥). واتا: زۆرێک لەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام حوکم بەنەریتانێک دەکەن کەاللە داینەبەزاندوە وەک سەوالیف ی دەشتەکیەکان و وەک فەرمانی گوێڕایەڵ بۆکراوان وە وای دەبینن ئەوەی ئەوان حوکمی پێ دەکەن پێویستە حوکمی پێ بکرێت لەجیاتی کتاب وسوننە. وە ئائەمەش کوفرە.

هەروەها ابن تيمية دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ (النِّسَاءِ ٥٩). دەڵێ: (فَالْأُمُورُ الْمُشْتَرَكَةُ بَيْنَ الْأُمَّةِ لَا يُحَكَّمُ فِيهَا إِلَّا الْكِتَابُ وَالسُّنَّةُ، لَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُلْزِمَ النَّاسَ بِقَوْلِ عَالِمٍ وَلَا أَمِيرٍ وَلَا شَيْخٍ وَلَا مَلِكٍ وَمَنِ اعْتَقَدَ أَنَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَ النَّاسِ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، وَلَا يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ فَهُوَ كَافِرٌ) (منهاج السنة (١٣٢/٥). واتا: ئەوشتانەی هەموو ئومەت تێیدا بەشدارن نابێت بەهیچ شتێ حوکمیان لەنێواندا پێ بکرێت ئیلا قورئان وسونەت نەبێت وە بۆهیچ کەسێ نیە خەڵکی پابەند بکات بەوتەی زانایەک یان ئەمیرێک یان شێخێک یان پاشایەک وە هەرکەس گومانی برد کەحوکم لەنێوان خەڵکی دەکات بەشتێ لەوانە لەجیاتی حوکم کردن بەکتاب وسونەت ئەوا ئەوکەسە کافرە.

شيخ الإسلام ابن تيمية دەڵێ: (وَالْإِنْسَانُ مَتَى حَلَّلَ الْحَرَامَ - الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ - أَوْ حَرَّمَ الْحَلَالَ - الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ - أَوْ بَدَّلَ الشَّرْعَ - الْمُجْمَعَ عَلَيْهِ - كَانَ كَافِرًا مُرْتَدًّا بِاتِّفَاقِ الْفُقَهَاءِ. وَفِي مِثْلِ هَذَا نَزَلَ قَوْلُهُ عَلَى أَحَدِ الْقَوْلَيْنِ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ أَيْ هُوَ الْمُسْتَحِلُّ لِلْحُكْمِ بِغَيْرِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ) (مجموع الفتاوى (٢٦٧/٣). واتا: مرۆڤ هەرکاتێک شتێکی حەڵاڵی حەرام کرد کە کۆدەنگی هەیە لەسەر حەڵاڵیەتی ، یان حەرامێکی حەڵاڵ کرد کە کۆدەنگی هەیە لەسەر حەرامیەتی ، یان شتێکی لە دینی ئیسلام گۆڕی کە کۆدەنگی هەیە سەری ، ئەوە ئەوکەسە کافرە بە کۆدەنگی هەموو شەرع زانان، وەلەهاوشێوەی ئەمەدا وتەکەی اللَّه تعالی دائەبەزێتە سەری یەکێ لەوتەکان کە اللَّه تعالی فەرمویەتی: هەرکەسێك حوکم نەکات بەوەی اللَّه تعالی داییەزاندوە ئائەوانە بێ باوەڕن، واتا: ئەوکەسە حەڵاڵی کرد حوکم بکات بەغەیری ما أنزل اللَّه.

هەروەها ابن تيمية دەڵێ: (وَمَنْ بَدَّلَ شَرْعَ الْأَنْبِيَاءِ وَابْتَدَعَ شَرْعًا فَشَرْعُهُ بَاطِلٌ لَا يَجُوزُ اتِّبَاعُهُ كَمَا قَالَ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ وَلِهَذَا كَفَرَ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى لِأَنَّهُمْ تَمَسَّكُوا بِشَرْعٍ مُبَدَّلٍ مَنْسُوخٍ). ((مجموع الفتاوى (٣٥/ ٣٦٥)). واتا: هەركەسێك شەرعی پێغەمبەران بگۆڕێ، شەرعێكی تر دابێنێ، ئەوە ئەو شەرعەی باتڵەو دروست نییە شوێنی بكەوی، هەروكو چۆن اللّٰه تعالی فەرموویەتی: بەڵكو ئایا ئەوان كەسانێكیان كردووە بە شەریك بۆ اللّٰه تعالی تا تەشریعیان بۆ بكەن و یاسایان بۆ دابنێن لە دیندا كە اللّٰه تعالی ئیزنی پێ نەداوە.

هەر بۆیە اللّٰه تعالی یەهودو نەصارای بەكافر دانا، لەبەر ئەوەی دەستیان گرتووە بەشەرعێكی گۆڕدراوی نەسخ بۆوەوە.

ابن تيية لە وتەیەکی دووروو درێژدا لەدەربارەی حوکم کردن بەغەیری قورئان دەڵێ: (وَأَمَرَهُ أَنْ يَحْكُمَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ، وَحَذَّرَهُ أَنْ يَفْتِنُوهُ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ، وَأَخْبَرَهُ أَنَّ ذَلِكَ هُوَ حُكْمُ اللَّهِ، وَمَنِ ابْتَغَى غَيْرَهُ فَقَدِ ابْتَغَى حُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَقَالَ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (الْمَائِدَة: ٤٤) وَلَا رَيْبَ أَنَّ مَنْ لَمْ يَعْتَقِدْ وُجُوبَ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ فَهُوَ كَافِرٌ، فَمَنِ اسْتَحَلَّ أَنْ يَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا يَرَاهُ هُوَ عَدْلًا مِنْ غَيْرِ اتِّبَاعٍ لِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَهُوَ كَافِرٌ). (منهاج السنة النبوية (١٣٠/٥). واتا: اللَّه تعالی ئەمری کردووە بە پێغەمبەر ﷺ کە حوکم بەوە بکات کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، وە پێغەمبەری ئاگادار کردۆتەوە لەوەی کە حەقی لێ بشوێنن و فێڵی لێبکەن لەهەندێك لەوەی اللَّه تعالی دایبەزاندووە، وە هەواڵی پێداوە کە ئەوە حوکمی اللّه یە، وەهەرکەسێك غەیری حوکمی اللَّه تعالی هەڵبژێرێ ئەوە حوکمی جاهلیەتی هەڵبژاردووە، اللَّه تعالی دەفەرموویێت: هەرکەسێك حوکم بەقورئان نەکات ئەوانە لە بێباوەڕانن.

وە گومانی تێدا نییە ئەگەر کەسێك بیرباوەڕی وا نەبێت کە حوکمی اللَّه تعالی کە ناردۆتیە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ واجبە ئەوا بێباوەرە، وە هەرکەسێك بەحەڵالی بزانێ و حوکم بەوە بکات لەنێوان خەڵکی کە خۆی پێی باشەو دادپەروەریە بەبێ ئەوەی شوێن ئەو حوکم بکەوێت کە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، ئەوا بێباوەرە.

ابن تيمية دەڵێ: (وَالْإِيجَابُ وَالتَّحْرِيمُ لَيْسَ إلَّا لِلَّهِ وَلِرَسُولِه فَمَنْ عَاقَبَ عَلَى فِعْلٍ أَوْ تَرْكٍ بِغَيْرِ أَمْرِ اللَّهِ وَرَسُولِه وَشَرَعَ ذَلِكَ دِينًا، فَقَدْ جَعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَلِرَسُولِه نَظِيرًا بِمَنْزِلَةِ الْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ جَعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا، أَوْ بِمَنْزِلَةِ الْمُرْتَدِّينَ الَّذِينَ آمَنُوا بِمُسَيْلِمَةَ الْكَذَّابِ وَهُوَ مِمَّنْ قِيلَ فِيهِ). (الفتاوى الكبرى: (٦/٣٣٩). واتا: بە واجب دانان و حەرام کردن تەنها مافی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ هەرکەسێك سزایەك بدات بەهۆی کارێکەوە یان وازهێنانان لەشتێك، بەبێ فەرمانی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ و کردی بەدین، ئەوە هاوبەشی بۆ اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ داناوە، وەك ئەو موشریکانەی کە هاوبەشیان بۆ اللَّه تعالى دانا وە وەك ئەو هەڵگەڕاوانەی ئیمانیان هێنا بە موسەیلەمەی درۆزن.

ابن حزم ئیجماع نەقڵ دەکات دەڵێ: (لا خِلافَ بين اثنين مِن المُسلمينَ ... أنَّ من حَكَم بحُكم الإنجيل مِمَّا لم يأتِ بالنَّصِّ عليه وَحيٌ في شريعة الإسلام، فإنَّه كافِرٌ مُشْرِكٌ خارِجٌ عن الإسلام). (الأحكام: (٥/١٧٣_١٧٤). واتا: هیچ ڕاجیاییەك نییە لە نێوان دوو کەس لە مسوڵمانان بەوەی هەرکەسێك حوکم بکات بەیاسای ئینجیل کە لە ئیسلامدا ئاماژەی بەڕاستی ئەوە نەکردبێت ئەوە ئەو کەسە بێباوەڕێکی موشریکە و دەرچووە لە ئیسلام.

ابن كثير دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ دەڵێ: (يُنْكِر تَعَالَى عَلَى مَنْ خَرَجَ عَنْ حُكْم اللَّه الْمُحْكَم الْمُشْتَمِل عَلَى كُلّ خَيْر النَّاهِي عَنْ كُلّ شَرّ وَعَدَلَ إِلَى مَا سِوَاهُ مِنْ الْآرَاء وَالْأَهْوَاء وَالِاصْطِلَاحَات الَّتِي وَضَعَهَا الرِّجَال بِلَا مُسْتَنَد مِنْ شَرِيعَة اللَّه كَمَا كَانَ أَهْل الْجَاهِلِيَّة يَحْكُمُونَ بِهِ مِنْ الضَّلَالَات وَالْجَهَالَات مِمَّا يَضَعُونَهَا بِآرَائِهِمْ وَأَهْوَائِهِمْ وَكَمَا يَحْكُم بِهِ الشَّارِع مِنْ السِّيَاسَات الْمَلَكِيَّة الْمَأْخُوذَة عَنْ مَلِكهمْ جنكزخان الَّذِي وَضَعَ لَهُمْ الياسق وَهُوَ عِبَارَة عَنْ كِتَاب مَجْمُوع مِنْ أَحْكَام قَدْ اِقْتَبَسَهَا عَنْ شَرَائِع شَتَّى : مِنْ الْيَهُودِيَّة وَالنَّصْرَانِيَّة وَالْمِلَّة الْإِسْلَامِيَّة وَغَيْرهَا وَفِيهَا كَثِير مِنْ الْأَحْكَام أَخَذَهَا مِنْ مُجَرَّد نَظَره وَهَوَاهُ فَصَارَتْ فِي بَنِيهِ شَرْعًا مُتَّبَعًا يُقَدِّمُونَهَا عَلَى الْحُكْم بِكِتَابِ اللَّه وَسُنَّة رسول اللَّه ﷺ فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَهُوَ كَافِر يَجِب قِتَاله حَتَّى يَرْجِع إِلَى حُكْم اللَّه وَرَسُوله فَلَا يُحَكِّم سِوَاهُ فِي قَلِيل وَلَا كَثِير قَالَ تَعَالَى " أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّة يَبْغُونَ " أَيْ يَبْتَغُونَ وَيُرِيدُونَ وَعَنْ حُكْم اللَّه يَعْدِلُونَ " مَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللَّه حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ " أَيْ وَمَنْ أَعْدَلُ مِنْ اللَّه فِي حُكْمه لِمَنْ عَقَلَ عَنْ اللَّه شَرْعه وَآمَنَ بِهِ وَأَيْقَنَ وَعَلِمَ أَنَّ اللَّه أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ وَأَرْحَمُ بِخَلْقِهِ مِنْ الْوَالِدَة بِوَلَدِهَا فَإِنَّهُ تَعَالَى هُوَ الْعَالِم بِكُلِّ شَيْء الْقَادِر عَلَى كُلّ شَيْء الْعَادِل فِي كُلّ شَيْء). (تفسير ابن كثير: (٣/١٣١) واتا:

اللَّه تعالى ئینكاری لە كردەوەی ئەو كەسە دەكات كە لە حوكمی تەواو و پڕ لە هەموو چاكە و خێرێك و نەهی كردوو لە هەموو خراپەیەك دەرچووە و لایداوە بەرەو شتی تری جگە لەو لە بۆچوون و هەوا و ئارەزو و وشەكانی

تر، لەو بۆچونانەی کە خەڵکی خۆیان دروستیان کردووە و دایانهێناوە بەبێ هیچ پشتیوانییەك لە شەریعەتی اللَّه تعالی، هەروەك ئەو شتانەی کە خەڵکی نەفامی حوکمیان پێ دەکرد لە گومڕایی و نەفامێتی بەوەی خۆیان بە بۆچوون و ئارەزووی خۆیان دایاندەهێنا وە هەروەك ئەو شتەی تەتارەکان حوکمی خەڵکییان پێ دەکرد لە سیاسەتی پاشایەتی کە لە جەنگیزخانی پاشایان وەریان گرتبوو کە کتێبێکی بۆ دانابوون بە ناوی یساق (یاسق) کە پێکهاتبوو لە کتێبێك کۆکراوە لەئەحکامەکان و وەری گرتبوو لە چەندان شەریعەتی جیا: هەر لە شەریعەتی جولەکە و گاور و میللەتی ئیسلام، وە زۆر ئەحکامی تری تیا بوو تەنها لە بۆچوون و ئارەزووی خۆی وەری گرتبوو و دایینابوو، تا وای لێ هاتبوو ئەم کتێب و یاسایە لە ناو نەوەکانییدا کرابووە شەرعێکی شوێنکەوتوو، پێشیان خستبوو بەسەر حوکمی اللَّه تالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ جا هەرکەسێك لەوان ئەو کارە ئەنجام بدات ئەوە کافرە و پێویستە کوشتاری لەگەڵ بکرێت هەتا دەگەڕێتەوە بۆ لای حوکمی اللَّه تعالی و پێغەمبـەرەکەی ﷺ تا جگە لە قورئانی پیرۆز کەسی تر حوکم نەکات لە کەم و زۆردا. اللَّه تعالی دەفەرموێت: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ واتە: ئایا حوکمی نەفامێتی داوا دەکەن و دەیانەوێت و لە حوکمی اللَّه تعالی لادەدەن؟ ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾، واتە: کێ هەیە لە اللَّه تعالی دادپەروەرتـر بێت لە حوکمیدا بۆ کەسێك کە لەشەرعی اللَّه تعالی تێگەیشتبێت و ئیمانی پێ هێنابێت و یەقینی هەبێت و زانستی

بەوە هەبێت کە اللَّە تعالی چاکترینی حاکمانە وە زۆر بە بەزەییترە بە دروستکراو و بەندەکانی لە دایك بە منداڵەکانی، چونکە اللَّە تعالی ئاگادارە بە هەموو شتێك و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا و دادپەروەرە لە هەموو شتێکدا.

ابن القیم ئیجماع نەقڵ دەکات و دەڵێ: (قد جاء القرآنُ وصحَّ الإجماعُ بأنَّ دينَ الإسلامِ نَسَخَ كُلَّ دين كان قَبْلَه، وأنَّ من التزم ما جاءت به التَّوراةُ والإنجيلُ ولم يتَّبِع القُرآنَ، فإنَّه كافِرٌ، وقد أبطل اللهُ كلَّ شريعةٍ كانت في التَّوراةِ والإنجيلِ وسائِرِ المِلَلِ). (أحكام أهل الذمة: (١/٢٥٩). واتا: قورئان هاتووە و یەکدەنگی دامەزراوە لەسەر ئەوەی کە دینی ئیسلام دینەکانی تری سڕیوەتەوە و نسخ کردووەتەوە هەرکەسێك پابەند بێت بەوەی هاتووە لە تەورات و ئینجیلەوە و شوێن قورئان نەکەوێت ئەوا ئەو کافرە، اللَّە تعالی هەموو یاسا و ڕێسایەکی تەورات و ئینجیل و میلەتەکانی تری سڕیوەتەوە.

إِسْمَاعِيلُ الْقَاضِي دەربارەی ئایەتی حوکم کردن دەڵێ: (ظَاهِرُ الْآيَاتِ يَدُلُّ عَلَى أَنَّ مَنْ فَعَلَ مِثْلَ مَا فَعَلُوا وَاخْتَرَعَ حُكْمًا يُخَالِفُ بِهِ حُكْمَ اللَّهِ وَجَعَلَهُ دِينًا يُعْمَلُ بِهِ فَقَدْ لَزِمَهُ مِثْلُ مَا لَزِمَهُمْ مِنَ الْوَعِيدِ الْمَذْكُورِ حَاكِمًا كَانَ أَو غَيره). (فتح الباري: ١٣/١٢٠). واتا: ڕووکەشی ئایەتەکان بەڵگەن لەوەی هەرکەسێك کارێك بکات هاوشێوەی جولەکەکان، وە حوکمێکی داهێنا پێچەوانەی حوکمی اللَّه تعالى بێت وە کردییە دینێك کاری پێ بکرێت ئەوا ئەو هەڕەشە و سزایە دەیگرێتەوە کە باسکراوە، جا حاکم بێت یان جگە لەحاکم.

محمد بن إبراهيم آل الشيخ دەڵێ: (إنَّ من الكُفْر الأكبَر المُستبين تنزيلَ القانون اللَّعين مَنزلةَ ما نزل به الرُّوحُ الأمينُ، على قَلب مُحَمَّد ﷺ ليكونَ من المنذرينَ بلسان عَربيٍّ مُبين؛ لقَول الله عزَّ وجلَّ: ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ (النساء:٥٩). واتا : لەکوفری گەورەی ڕوون دانانی یاسای نەفرین لەشوێنی ئەو دابەزێنراوەی جیبریلی ئەمین بۆسەر دڵی رسول اللَّه ﷺ تا ببێتە ئاگادار کەرەوە بەزمانێکی عەرەبی پاراو لەبڕیاردانی نێوان خەڵکی ململانێ و دژی وتەی اللَّه تعالى یە کە دەڵێت: ئەگەر ناکۆکیتان هەبوو لە شتێك ئەوا بیگێرنەوە لای اللَّه تعالى و پێغەمبەر ﷺ ئەگەر باوەڕتان بە اللَّه تعالى و ڕۆژی دواییە ئەمە چاکترە و باشترین لیکدانەوەیە.

عبدالرحمن بن حسن دەڵێ: (مَنْ دَعَا إلى تَحْكِيم غيرِ الله تعالىَ ورسولِه فقدْ تَرَكَ ما جاءَ بِه الرسولُ ﷺ وَرَغِبَ عنهُ، وَجعَلَ لله شَرِيكًا في الطاعة، وخَالَفَ ما جاءَ بِه رسولُ الله ﷺ فيمَا أَمَرَهُ اللهُ تعالى بِه في قولِه: ﴿وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللهُ إِلَيْكَ﴾ (المائدة:٤٩). وقولِه: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ (النساء:٦٥). فمَنْ خَالَفَ ما أَمرَ اللهُ بِه رسولَهُ ﷺ، بأَنْ حَكَمَ بينَ الناسِ بغيرِ ما أَنْزَلَ اللهُ، أوْ طَلَبَ ذلكَ اتِّبَاعًا لِمَا يَهْوَاهُ وَيُرِيدُهُ فقدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإسلامِ والإيمانِ منْ عُنُقِه، وإنْ زَعَمَ أَنَّهُ مُؤْمِنٌ). (فتح المجيد: ص (٣٩٢). واتا: بەهەمان شێوە ئەوەی بانگەوازی بکات بۆ حوکم گێڕانەوەبۆ جگە لە اللّٰه تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا وازیهێناوە لەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی وپشتی لێکردووە، وە هاوبەشی بۆ اللّٰه تعالی بڕیارداوە لە گوێڕایەڵییدا، وەپێچەوانەی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی بەوەی اللّٰه تعالی فەرمانی پێکردووە وەك لە فەرمایشتی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾ وە فەرمایشتی: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾، جا ئەوەی پێچەوانەی ئەوە بکات کە اللّٰه تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێکردووە، بەوەی حوکم بکات لە نێوان خەڵکیدا بە جگە لە حوکمی اللّٰه تعالی یاخود داوای بکات بەهۆی ئەوەی

شوێن ئارەزووەكانی كەوتووە ویستی لێبێت، ئەوا پەتی ئیسلام و ئیمانی لە گەردنی كردۆتەوە گەر بانگەشەی ئەوەش بكات كە ئیمانداره جا ئەوە گومانی تێدا نییە كە تەبدیل و گۆڕینی حوكم كوفره بەئیجماعی زانایان.

ئێستاش لایەنی تەرككردنی حوكم باس دەكەین ئەو كەسەی كە تەنها تەركی تەواوی حوكمی اللَّه تعالی كردووە لەشوێنی خۆی باسی وتەی سەلەفیش دەكەین إن شاءاللَّه:

ئیمامی قاسمی دەربارەی ئایەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْـزَلَ اللَّهُ﴾ دەڵێ: (أَيْ: كَائِنًا مَنْ كَانَ، دُونَ الْمُخَاطَبِينَ خَاصَّةً حَيْثُ عَلَّقَ فِيهِ الْحُكْمَ بِالْكُفْرِ بِمُجَرَّدِ تَرْكِ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى، فَكَيْفَ وَقَدِ انْضَمَّ إِلَيْهِ الْحُكْمُ بِخِلَافِهِ؟) (تفسير القاسمي (ج:٦/ ص:١٩٩٨- ١٩٩٩). واتا:هەركەسێك حوكم بەوە نەكات كە اللَّه تعالی دایبەزاندووە واتا: هەركێیەك بێت بەبێ ئەوەی وتەكە بۆ كەسانێكی تایبەت وترابێ بەجۆرێك حوكمی كوفری بەسەردان بەتەنها لەبەر ئەوەی تەركی حوكمی ئەوەیان كردبوو كە اللَّه تعالی دایبەزاندووە، جا چۆن دەبێت گەر حوكمێكی پێچەوانەی تری بدرێتە پاڵ؟ جا سەرنج بدە گوتی: عَلَّقَ فِيهِ الْحُكْمَ بِالْكُفْرِ بِمُجَرَّدِ تَرْكِ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى. واتا: بەجۆرێك حوكمی كوفری بەسەردان بەتەنها لەبەر ئەوەی تەركی حوكمی ئەوەیان كردبوو كە

اللَّه تعالى دايبەزاندووە. تەنها بەهۆی ترك كردنيان نەك تەشريع و تەبديل و ئيستحلال و جحود !

ئيمامی أبو الجعفر النحاس دەڵێ: (وَقَدْ قيلَ: مَنْ تَرَكَ الْحُكْمَ بِجَميعِ مَا أَنْزلَ الله فَهوَ كافر). (كتاب إعراب القرآن للنحاس (١/ ٢٦٩) واتا: گوتراوە: هەركەسێك تەركی تەواوی ئەو حوكمە بكات كە الله دايبەزاندووە ئەوا كافرە.
جا چ شتێك لەو بەڵگانە ڕوونترن ! الله داوای سەلامەتيت لێدەكەين !

هەروەها ثەعلەبی دەڵێ: (وَسُئِلَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ يَحْيَى الْكِنَانِيُّ عَنْ هَذِهِ الْآيَاتِ، فَقَالَ: إِنَّهَا تَقَعُ عَلَى جَمِيعِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَا عَلَى بَعْضِهِ فَكُلُّ مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِجَمِيعِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَهُوَ كَافِرٌ ظَالِمٌ فَاسِقٌ فَأَمَّا مَنْ حَكَمَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ التَّوْحِيدِ وَتَرْكِ الشِّرْكِ، ثُمَّ لَمْ يَحْكُمْ بِجَمِيعِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ الشَّرَائِعِ لَمْ يَسْتَوْجِبْ حُكْمَ هَذِهِ الْآيَاتِ). (تفسير الثعلبي الكشف والبيان عن تفسير القرآن (٤/٧٠) واتا: پرسيار كرا لە عبدالعزيز كوڕی يەحيا كينانی دەربارەی ئەو ئايەتانەی حوكم: گوتی: دادەبەزێتە سەر ئەوانەی كەحوكم بەهەمو دابەزێنراوەكەی الله ناكەن جا هەركەس حوكم بەهەمو دابەزێنراوەكەی الله نەكات كافرو زاڵم و فاسقيشە بەڵام كەسێ حوكم بەدابەزێنراوی الله بكات لەتەوحيد (واتا موحيد بێت) بەڵام لەهەندێ حوكمدا حوكم بەشەرعی الله نەكات ئەوە ئەوا ئەوكات كوفری هەقيقی نايگرێتەوە.

جا چ شتێك لەو بەڵگانە ڕوونترن! الله داوای سەلامەتیت لێدەکەین !

زيد بن أسلم دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ دەڵێ: (قال: بهَذَا حَكَمَ لِكتَابه، فَمَنْ تَرَكَ الْحُكْمَ بِكِتَابِ اللّهِ فَقَدْ كَفَرَ). واتا: زەیدی کوڕی ئەسلەم لە تەفسیرەکەی دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ دەڵێ: اللَّه تعالى هەر بەو شێوەیەش حوکمی لەسەر کیتابەکەی (واتا: قورئان) داوە، جا هەر کەسێك حوکمکردن بەقورئان تەرك بکات ئەوە بێ باوەرە.

گوتم: سەرنج بدە تەرككردنی حوکمی گوت نەك تەبدیل و تەشریع !، وە وشەی الفاسقونی لێرە بەکوفری مُخرج من الملة وەسفکرد. وەهەروەها لەپاشان لەتەفسیری وشەی: الكافرون والظالمون والفاسقون, دەڵێ: (والمراد بالظّلم والفسق هو الكفر) واتا: مەبەست لەو زوڵم و فیسقە کوفرە.

ئیمامی أبو بکر الجصاص دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ دەڵێ: (وَفِي هَذِهِ الْآيَةِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ مَنْ رَدَّ شَيْئًا مِنْ أَوَامِرِ اللَّهِ تَعَالَى أَوْ أَوَامِرِ رَسُولِهِ ﷺ فَهُوَ خَارِجٌ مِنْ الْإِسْلَامِ سَوَاءٌ رَدَّهُ مِنْ جِهَةِ الشَّكِّ فِيهِ أَوْ مِنْ جِهَةِ تَرْكِ الْقَبُولِ وَالِامْتِنَاعِ مِنْ التَّسْلِيمِ وَذَلِكَ يُوجِبُ صِحَّةَ مَا ذَهَبَ إلَيْهِ الصَّحَابَةُ فِي حُكْمِهِمْ بِارْتِدَادِ مَنْ امْتَنَعَ مِنْ أَدَاءِ الزَّكَاةِ وَقَتْلِهِمْ) أحكام القرآن(٣/ ١٨١) واتا: ئەوئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەهەر کەسێک شتێک لەفەرمانەکانی اللّٰە تعالی یان فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەتکاتەوە، ئەوە لەئیسلام چۆتە دەرەوە، جا چ ڕەتکردنەوەکەی لەڕووی شک و گومانەوەبێ یاخود لەڕووی واز لێهێنان و تەرك کردن بێ و قەبوڵی نەبێ و ڕێگربێ لەتەسلیم بوون، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کەصەحابە بۆی چوون حوکمدانیان بەڕیددەت و قەتل، لەسەر ئەو کەسەی کە منعی زەکاتیان کرد .سەرنج بدە ئیمام گوتی لەڕووی تەرکەوەش بێت کاتێك گوتی: أَوْ مِنْ جِهَةِ تَرْكِ الْقَبُولِ واتا: یاخود لەڕووی واز لێهێنان و تەرك کردن و قەبووڵ نەکردن بێ.

ابن تیمیة دەڵێ: (فَإِنَّ هَذَا الشَّرْعَ لَيْسَ لِأَحَدِ مِنْ الْخَلْقِ الْخُرُوجُ عَنْهُ وَلَا يَخْرُجُ عَنْهُ إلَّا كَافِرٌ). (مجموع الفتاوی(١١/ ٢٦٢) واتا: ئەو شەرعە شەرعی ئیسلام، بۆ هیچ کەسێک نییە لەخەڵکی لێی بچێتە دەرەوە، وەهیچ کەسێک لێی ناچێتە دەرەوە مەگەر بێ باوەڕ نەبێ.

بەهەمان شێوە ابن تیمیة دەڵێ: (وَمَنْ لَمْ يَلْتَزِمْ حُكْمَ اللَّهِ وَرَسُولِه فَهُوَ كَافِرٌ..وَمَن اعْتَقَدَ أَنَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَ النَّاسِ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلكَ، وَلَا يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ فَهُوَ كَافِرٌ). (منهاج السنة(ج٥/ ص:١٣٢) واتا: کەسێک ئیلتیزام و پەیوەست نەبێ، بەحوکمی الله و پێغەمبەرەکەی، ئەوە بێ باوەڕە، وەهەرکەسێک بیروباوەڕی وابێ لەنێوان خەڵکی حوکم دەکات بەشتێک لەوە، وە حوکم ودادوەری ناکات لەنێوانیان بە قورئان سوننەت، ئەوە بێباوەڕە.

وتەکەی ابن تیمیە ڕونە جا چ ئەو حوکم نەکردنەوەی بەنکوڵی لێکردن بێت یاخود بەتەرکردن بێت چونکە ئیلتیزامی نەبوو بەحوکمی اللَّه تعالی و ملکەچ نەبووە.

هەروەها ابن تیمیة دەربارەی ئەو ئەو عالمەی کە شوێن حوکمی اللَّه تعالی ناکەوێ و تەرکی دەکات دەڵێ: (وَمَتَى تَرَكَ الْعَالِمُ مَا عَلِمَهُ مِنْ كِتَابِ اللَّه وَسُنَّةِ رَسُولِهِ وَاتَّبَعَ حُكْمَ الْحَاكِمِ الْمُخَالِفِ لِحُكْمِ اللَّه وَرَسُولِه كَانَ مُرْتَدًّا كَافِرًا). (مجموع الفتاوی(٣٥/ ٣٧٣_٣٧٤ ) واتا: هەر کاتێك زانا پشتی لەو زانستە کرد و تەرکی کرد کە زانیویەتی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ، وە شوێن حوکمی حاکمێك کەوت پێچەوانەی حوکمی اللَّه تعالی و پێغەمبەرەکەیە، ئەوا هەڵگەڕاوەیە و بێباوەرە.

ابن تيمية دەڵێ: (فبَيَّن سُبحانَه أنَّ من توَلَّى عن طاعةِ الرَّسولِ، وَأَعْرَضَ عَنْ حُكْمِه؛ فَهُوَ من المنافقين وَليسَ بمؤمن، وأنَّ المؤمنَ هُو الذي يَقولُ: سَمعْنا وأطَعْنا، فَإذَا كانَ النِّفاقُ يَثْبُتُ، وَيَزولُ الإيمانُ بمجَرَّدِ الإعْرَاضِ عَنْ حُكْمِ الرَّسولِ وإرادةِ التحاكُمِ إلى غيره، مع أنَّ هذا تَرْكٌ مَحْضٌ، وقد يكونُ سَبَبُه قُوَّةَ الشَّهوةِ؛ فكيف بالتنَقُّصِ والسَّبِّ ونَحْوِه؟) (الصارم المسلول على شاتم الرسول: ١/٣٧_٣٨). واتا: اللَّه تعالى ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوەی لابدات لەگوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ وە پشتی تێبکات، ئەوا لە دووڕووانە و ئیماندار نییە، لەبەر ئەوەی موسڵمان ئەوەیە کەدەڵێت: گوێمان گرت و گوێڕایەڵ بووین، جا ئەگەر دووڕوویی جێگیر بوو، وە ئیمان لادەچێت تەنها بەپشت کردن لە حوکمی پێغەمبەر ﷺ و ویستنی حوکم گێڕانەوە بۆ لای جگە لەو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە تەرکردنە، لەوانەیە ئەو وازهێنانەی حوکمی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی بەهێزی ئارەزووەوە بێت، ئەی چی بە کەم کردنەوەی ئەو حوکم و جنێو پێدانی؟ جا جوان سەرنج بدە ابن تيمية ڕوونی کردەوە کە ئیمان لادەچێت و نامێنێت تەنها بەپشت تێکردن و تەرك کردنی حوکمی پێغەمبەر، هەتا ئەگەر ئەو تەرك کردنە پەیوەستیش نەبێت بە حەڵاڵ زانین یاخود بە نکوڵی لێکردن!

هەروەها ابن تیمیة دەڵێ: (وَمَعْلُومٌ أَنَّ مَنْ أَسْقَطَ الْأَمْرَ وَالنَّهْيَ الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ بِهِ رُسُلَهُ فَهُوَ كَافِرٌ باتِّفَاقِ الْمُسْلِمِينَ) (مجموع الفتاوى (١٠٦/٨). واتا: وە زانراویشە بەڕاستی کەسێك فەرمانێك یاخود نەهییێك پەك بخات کە اللَّه تعالی رسول کەی ﷺ پێی ناردبێت ئەوە بێباوەرە بەکۆدەنگی موسوڵمانان.

ئیمامی ابن الكثير دەڵێ: (فَمَنْ تَرَكَ الشَّرْعِ الْمُحْكَم الْمُنَزَّلُ عَلَى مُحَمَّدِ بْنُ عَبْدِ اللَّه خَاتَمُ الْأَنْبِيَاءِ وتحاكم إلَى غَيْرِهِ مِنْ الشَّرَائِعِ الْمَنْسُوخَة كَفَر ، فَكَيْفَ بِمَن تَحاكَمَ إلَى الياسا وَقَدَّمَهَا عَلَيْه ؟ مِنْ فِعْل ذَلِكَ كَفَرٌ بِإِجْمَاعِ الْمُسْلِمِينَ). (البداية وَالنِّهَايَة (١٣/١٣٩) واتا: هەر کەسێك وازبهێنێت لەو شەرعە دادپەروەرەی دابەزێنراوە بۆ سەر محمدی کوڕی عبداللَّه کۆتا پەیامبەر، وە حوکمی گێڕایەوە بۆ جگە لەشەرعی اللَّه تعالی و حوکمی گێڕایەوە بۆ شەریعەتە نەسخ بووەکان و سڕاوەکان ئەوا کافر دەبێت، ئەی چی دەربارەی ئەوەی حوکم بگێڕێتەوە بۆ یاسا و پێشی بخات؟، جا هەر کەسێك ئەو کارە بکات ئەوا بێباوەڕبووە بە یەکدەنگی موسڵمانان.

سەرنجبدە ئیمام گوتی: کەسێك تەرکی حوکم بکات، لەدین دەچێتە دەرەوە، پاشان دەڵێ: چجای ئەوەی کەسێك حوکم بەرێتەوە بۆ لای یاسا کە جەنگیز خان حوکمی پێدەکرد، جا وتەکەی ئیمام ڕوونە کە کەسێك تەنها بەتەرکی حوکم لەدین دەردەچێت، چجای ئەوەی ئەو یاسایەی کە جەنگیزخان حوکمی پێدەکرد ئەویش بەهاوشێوە ئەو بیکات ئەوە زۆر خەتەرترە !!

ئەوەش ڕەدێکە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن ئیمام ئیجماعەکەی لەسەر تەبدیل و تەغییر هێناوە ! لێرەدا ئیمام زۆر بەڕوونی باسی کردووە ولله الحمد.

ابن القیم دەفەرموویّت: (قال قتادة: كلمتان يسأل عنهما الأولون والآخرون: ماذا كنتم تعبدون، وماذا أجبتم المرسلين؟ وهاتان الكلمتان هما مضمون الشهادتين. وقد قال تعالى: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾؛ فأقسم سبحانه بأجل مقسم به - وهو نفسه عز وجل - على أنه لا يثبت لهم الإيمان، ولا يكونون من أهله، حتى يحكموا رسول اللَّه ﷺ في جميع موارد النزاع في جميع أبواب الدين؛ فإن لفظة (ما) من صيغ العموم؛ فإنها موصولة تقتضي نفي الإيمان). (الرسالة التبوكية: ص (٢٤)). قەتادە فەرموویەتی: دوو ووشە هەن پسیاریان لێدەکرێت لە پێشینان و پاشینان: چیتان ئەپەرست و چ وڵامیکی پێغەمبەرانتان دایەوە؟، ئەم دوو وشەیە دڵنیای دوو شەیاتومانەکەن وە اللَّه تعالی فەرموویەتی: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾ اللَّه تعالیسوێندی خواردووە بەنەفسی خۆی کە ئیمان ناهێنن و جێگیر نابێت تیایاندا وە لەکۆمەڵەی ئیمانداران نابن تاوەك پێغەمبەرەکەی ﷺ نەکەن بە دادوەر لەهەموو ئەو کیشە و ناکۆکیانەی لەنێوانیان

ڕووئەدات لەبوارەکانی ديندا، بۆيە لەفزی (ما) لەشێوەی گشتييە، کە موصولەيە کە تەواوی ئيمان لا ئەبات.

هەروەها ابن القيم دەڵێ: (لم يحكم لهَؤُلَاء الْيَهُود الَّذين شهدُوا لَهُ بالرسالة بِحكم الاسلام...وَهَذَا مُتَّفق عَلَيْهِ بَين الصَّحَابَة وَالتَّابِعينَ وائمة السّنة ان الايمان لَا يَكْفِي فِي قَول اللِّسَان بمُجَرَّدِه وَلَا معرفَة الْقلب مَعَ ذَلِك بل لَا بُد فِيه من عمل الْقلب وَهُوَ حبه لله وَرَسُوله وانقياده لدينه والتزامه طَاعَته ومتابعة رَسُوله وَهَذَا خلاف من زعم ان الايمان هُوَ مُجَرّد معرفَة الْقلب واقراره) (مفتاح دار السعادة (٩٤/١). واتا: اللَّه حوكمی ئيسلامەتی بەسەر يەهوديەکان نەدا کە شايەتی ريسالەی رسول اللَّه ﷺ يان دا، ئەوە جێگای يەك دەنگی صەحابەو تابعين و ئەئيمەی سوننەيە بەوەی ئيمان بەس نييە بەس بەوتەی زمان و وە نەناسينی لەدڵەوە لەگەڵ ئەوەشدا هەردەبێ، کردەوە ی دڵيشی لەگەڵ بێت، کە بريتيبە لە خوشەويستی بۆ اللَّەو رسولەکەی ﷺ وە ملکەچ بوون بۆ دينەکەی و مولتەزيم بوون و گوێڕايەڵی کردنی، وە شوێنکەوتنی ڕەسولەکەی ئەوەش بەپێچەوانەی ئەو کەسەيە کەوای نيشانداوە کە ئيمان تەنها ناسينيە لەدڵەوەو دان پێدا نانە.

سەرنج بدە ئیمام چۆن ڕوونی کردەوە دەبێ لەهەموو شتێك شوێنی ئەو دینە بکەوی و تەواو ملکەچی بیت، بەپێچەوانەی ئەوانەی کە دەڵێن ئەگەر تەرکیشی بکات بەڵام بڕوای پێی هەبێت و نکوڵی لێ نەکات ئەوە موسوڵمانە ! سبحان اللَّە وەکو ئەو مورجیئانەی دەیان گوت ئیمان بەس وتە یەو کردەوەیان لێی وەدەر نابوو ! واللَّە المستعان.

هەروەها ابن القیم دەڵێ: (من عرف بقَلْبِه وأقَرَّ بلِسانِه، لم يكن بمجَرَّدِ ذلك مؤمنًا حتى يأتيَ..... وينقادُ لمتابعةِ رَسولِه ﷺ وطاعتِه والتزامِ شَريعتِه ظاهرًا وباطنًا) (عدة الصابرين) (ص: ١٠٩). واتا: هەرکەسێك بەدڵ زانی و بەزمان دانی پیانا، بەس بەوە نابێتە ئیماندار، هەتا... ملکەچی شوێنکەوتنی رسول اللَّە ﷺ دەبێ و گوێڕایەڵی دەبێ، وە ئیلتیزامی بەشەریعەتەکەی اللَّە تعالی دەبێ، لە دیارو ئاشکرا.

چەند جوانە شیعرەکەی سلیمان بن سحمان کە دەڵێ:

وَخَامِسُهَا فَالانْقِيَادُ وَضِدُّهُ ****** هُوَ التَّرْكُ لِلْمَأْمُورِ أَوْ فِعْلُ مُفْسِدِ
فَتَنْقَادُ حَقًّا لِلْحُقُوقِ جَمِيعِهَا ****** وَتَعْمَلُ بِالْمَفْرُوضِ حَتْمًا وَتَقْتَدِي
وَتَتْرُكُ مَا قَدْ حَرَّمَ اللهُ طَائِعاً ****** وَمُسْتَسْلِمًا لله بِالْقَلْبِ تَرْشُدِ
فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لله بِالْقَلْبِ مُسْلِمًا *** وَلَمْ يَكُ طَوْعًا بِالْجَوَارِحِ يَنْقَدِ
فَلَيْسَ عَلَى نَهْجِ الشَّرِيعَةِ سَالِكًا **** وَإِنْ خَالَ رُشْدًا مَا أَتَى مِنْ تَعَبُّدِ

واتا: پێنجەم ملکەچ بوون دژەکەی، کە بریتییە لەتەرك کردنی فەرمان پێکراوەکان، یان کردنی خراپە، بەدڵنیاییەوە ملکەچ دەبی بۆ هەموو حەقەکان، وە کار بەفەرزەکان دەکەی بەحەتمی و ئیقتیدای پێدەکەی، وە واز لەوە دێنی کە اللَّه تعالى حەرامی کردووە بەملکەچی، وە تەسلیمی اللَّه تعالى دەبی بەدڵ، ڕێنوێنی کراوی، جا کەسێك لەدڵەوە تەسلیمی اللَّه تعالى نەبێ، وە گوێڕایەڵی نەبوو بەلاشەو ملکەچ نەبوو، ئەوە لەسەر ڕیگەی شەریعەت نەڕۆیشتووە، ئەگەرچی عیبادەتیشی زۆربێ. سەرنج بدە جا کەسێك ملکەچ نەبێ بەکردەوە ئەوە لیسەر شەریعەت نییە چونکە ڕوونە ئیمان وتەو کردارە جا چۆن کەسێك بانگەشەی ئەوە دەکات دەڵێ ئیمان وتەو کردارەو دوایش لەدەربارەی ئەمرو فەرمانەکانی اللَّه تعالى دەڵێ کەسێك تەرکی تەواوی حوکمی بکات هێشتا موسوڵمانە!

ئیمامی سەعدی دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (فمَن ترك هذا التحكيم المذكور غير ملتزم له فهو كافر، ومَن تركه، مع التزامه فله حكم أمثاله من العاصين) (تفسير السعدي) واتا: هەرکەسێك ئەو تەحکیمە باسکراوە تەرك بکات بکات ( مەبەستی لێرە بەکوللیە بەبەڵگەی ئەوەی ئایەتە باسی بچوکترین شت تاکو گەورەترین شت دەکات)، پێوەی مولتەزیم نەبێت، ئەوە بێباوەرە، وە هەرکەسێك تەرکی لەگەڵ ئیلتیزام بوون پێوەی ئەوە حوکمی وەکو تەواوی ئەو تاوانبارانە وایە.

سلیمان بن عبدالله آل الشیخ دەڵێ: (نبَّه في هذا الباب على ما تضَمَّنَهُ التوحيدُ، واستلزمَهُ من تحكيم الرَّسُولِ ﷺ في مواردِ النزاع؛ إذ هذا هو مُقْتَضَى شهادةِ أَنْ لا إلهَ إلا اللهُ، ولازِمُها الذي لا بُدَّ منه لكلِّ مؤمن، فإنَّ مَن عَرَفَ أَنْ لا إلهَ إلا اللهُ، فلا بد من الانقيادِ لحكمِ اللهِ والتسليمِ لأَمرِهِ الذي جاءَ من عندِهِ على يدِ رسولِه محمدٍ ﷺ). (تيسير العزيز الحميد: ص (٥٥٤_٥٥٥). واتا: اللّه تعالی ئاگاداری داوە لەو بابەتەدا لەوەی تەوحیدی لێ پێکهاتووە و پێویستیەتی، لە حوکم گێڕانەوە بۆ لای رسول اللّه ﷺ لەکاتی کێشە و ناکۆکیدا، کەواتە ئەوە داواکاری شایەتومانی (لاالە الاالله) یە و پێویستیەکانیەتی کە پێویستە بۆ لەهەموو ئیماندارێکدا هەبێت.. بۆیە ئەوەی شایەدی (لاالە الاالله) بدات دواتر لایدا بۆ بە حوکم گێڕانەوە بۆ جگە لە رسول اللّه ﷺ لەکاتی هەبوونی کێشە و ناکۆکیدا، ئەوا درۆی کردووە لە شایەتوومانەکەی.

هەروەها ابن تیمیة ئەو بۆچوونەی ئەوانەی کە دەڵێن کە تەنها بەحەڵاڵ کردن پێی لەدین دەچێتە دەرەوە رەتدەداتەوە و دەڵێ: (وَمَنْ أَطْلَقَ مِنْ الْفُقَهَاءِ أَنَّهُ لَا يَكْفُرُ إلَّا مَنْ يَجْحَدُ وُجُوبَهَا فَيَكُونُ الْجَحْدُ عِنْدَهُ مُتَنَاوِلًا لِلتَّكْذِيبِ بِالْإِيجَابِ وَمُتَنَاوِلًا لِلِامْتِنَاعِ عَنْ الْإِقْرَارِ وَالِالْتِزَامِ) مجموع الفتاوی (٢٠/ ٩٨). واتا: هەرکەسێ لە زانایان وتبێتی کەئەوکەسە کافرنابێت ئیلا مەگەر نکۆڵی واجب بونی ئەو واجبە بکات (واتا: بەحەڵاڵی بزانێت کە واجبەکە ئەنجام نەدات) ئەوا نکۆڵیکردن لە واجب بوونی ئەوشتە لەلای ئەو زانایە مەبەست پێی بەدرۆخستنەوەی واجبەکەیە وەمەبەست پێشی ئەوەیە دانی پێ نەنێت وە پابەندی نەبێت. کەواتە ئەگەر پابەندیش نەبێت وەکو ئەوە وایە نکولی لێ بکات.

هەروەها تەرکردنی تەواوی حوکمی اللَّه جۆرێکە لە پشت هەڵکردن (الإعراض) ڕوونیشە پشت هەڵکردن هەڵوەشێنەرەوەیەکە لە هەڵوەشێنەرەوە یەکانی ئیسلام، وە إعراضیش بەچەند مانایەك دێت لەوانە: ملکەچ نەبوون، دانەهێنان، ئەوەش بەهۆی تەرکردن و کردەوە پێ نەکردن دەبێ، وە ڕێگری کردن لە جێ بەجێ کردنی شەریعەت و فەرمان پێکراوەکان، وە پشت هە ڵکردن لەگوێرایەڵێ گوێنەگرتن لە فەرمانەکانی الله و گوێ پێنەدان بەشەرع و تەرکردنی حوکم و حوکم نەبردنەوە بۆ حوکمی الله، هەروەکو چۆن محمدی کوڕی عبدالوهاب لەنەواقضی دەیەم دەڵێ: (الإعراض عن دين اللَّه لا يتعلمه ولا يعمل به) والدليل قوله تعالى: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنْتَقِمُونَ﴾ (السجدة:٢٢). واتا: پشت کردن یان ڕوو وەرگێڕان لە دینی الله بەوەی کە بیەوێت فێری نەبێت و کردەوەی پێ نەکات بەڵگەش وتەی الله یە کە دەفەرموێت: (جاکێ لەوە ستەمکارترە کە بە فەرموودەکانی الله ئامۆژگاری کرابێت پاشان پشتی تێ هەڵکردبێت و گوێی پێ نەدات بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانباران و موجریمان دەستێنین).

قَتَادَة دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ طه:٤٨).
واتا: بێگومان ئێمە ئاگادارکراوین، کە سزاو ئازارو بەڵا لەسەر ئەوانەیە کە ڕاستیەکان بە درۆ دەزانن و پشتی تێ دەکەن لێی یاخی دەبن.

دەڵێ: (كَذَّبَ بِكِتَابِ اللَّهِ ، وَتَوَلَّى عَنْ طَاعَةِ اللَّهِ) (تفسير الطبري(ج:١٨/ ص:٣١٦) واتا: قورئانی بەدرۆزانی و پشتی لەگوێڕایەڵی الله کرد.

ابن تيمية دەربارەی پشت هەڵکەر دەڵێ: (الْمُتَوَلِّي هُوَ الْعَاصِي الْمُمْتَنِعُ مِنْ الطَّاعَةِ) (مجموع الفتاوى (٥١٢/٧). واتا: پشتهەڵکەر بریتییە لە تاوانبارەی کە ڕێگرە لەگوێڕایەڵی.

ابن کثير دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (طه:٤٨). واتا: بێگومان ئێمە ئاگادارکراوین، کە سزاو ئازارو بەڵا لەسەر ئەوانەیە کە ڕاستیەکان بە درۆ دەزانن و پشتی تێ دەکەن لێی یاخی دەبن. دەڵێ : (كَذَّبَ بِقَلْبِهِ وَتَوَلَّى بِفِعْلِهِ) . (تفسير ابن كثير(ج:٥/ ص:٢٩٧) واتا: لەدڵەوە بەدرۆی زانی و پشتی لەکردەوە کرد، واتا:کردەوەی پێ نەکرد.

## بەڵگە دەربارەی کوفری إعراض پشت هەڵکردن و تەرکردن:

الله دەفەرموویت: ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ (نور:٤٧). واتا: مونافیقان ئەڵێن: ئێمەش ئیمانمان بە الله تعالی بە پێغەمبەری خوا هێناوە ﷺ وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوامان کردووە ﷺ ئەمە تەنها بە زمان نەك بە کردەوەو بیروباوەڕ لە دوای ئەوە کۆمەڵێك لەم مونافیقانە پشت هەڵئەکەن لە گوێڕایە ڵی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ئا ئەم کەسانە بەڕاستی باوەڕدار نین.

ئیمامی طەبەری دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ (نور:٤٧). دەڵێ: (يَقُولُ تَعَالَى ذِكْرُهُ: وَيَقُولُ الْمُنَافِقُونَ: صَدَّقْنَا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ، وَأَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَ ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ﴾ يَقُولُ: ثُمَّ تُدْبِرُ كُلُّ طَائِفَةٍ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ مَا قَالُوا هَذَا الْقَوْلَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَتَدْعُو إِلَى الْمُحَاكَمَةِ إِلَى غَيْرِهِ خَصْمَهَا ﴿وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ يَقُولُ: وَلَيْسَ قَائِلُو هَذِهِ الْمَقَالَةِ، يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا﴾ بِالْمُؤْمِنِينَ؛ لِتَرْكِهِمُ الِاحْتِكَامَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِعْرَاضِهِمْ عَنْهُ إِذَا دُعُوا إِلَيْهِ) (تفسير الطبري(ج:١٩/ص:٢٠٥) واتا: الله دەفەرموویت: دووڕووەکان دەڵێن: الله و رسولەکەی بەڕاست دەزانین وە گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەین الله دەفەرموویت: لە دوای

ئەوە کۆمەڵێك لەم مونافیقانە پشت هەڵئەکەن لە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ الله دەفەرمووێت: پاشان هەموو ئەو تائیفانە پشت لەوە دەکەن کە گوتیان لەدەربارەی رسول الله ﷺ وە بانگەشەی غەیری حوکمی رسول الله ﷺ دەکەن دژی حوکمی رسول الله ﷺ الله دەفەرمووێت: ئا ئەم کەسانە بەڕاستی باوەڕدار نین.

الله دەفەرمووێت: وە ئەو کەسەی ئەو وتە دەڵێ ئیماندار نین یانی وتەی الله کە مونافیقان دەڵێن: ئێمەش ئیمانمان بە خوای گەورەو بە پێغەمبەری خوا هێناوە. لەبەر تەرکردنیان لەحوکم هێناوە بۆلای رسول الله ﷺ وە پشت هە ڵکردنیان لە رسول اللَّه ﷺ کاتێك بانگ دەکرێن بۆ حوکمەکەی.

سەرنج بدە ئەوان گوتیان ئیمانمان هێنا بە اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ وە گوێڕایەڵی اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ دەکەین، بەڵام چونکە تەرکی حوکمی اللَّه تعالى یان کرد اللَّه تعالى فەرمووی ئەوانە ئیماندار نین ! جا ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە تەرکردنی حوکمی اللَّه بەتەواوەتی دەرچوون لەدین نییە، با لە اللَّه تعالى بترسن و لەو گومڕاییە خۆیان ڕزگار بکەن، چونکە وتەکەی اللَّه تعالى ڕوونە ئەو مونافیقانە گوتیان باوەڕمان هێناوەو گوێڕایەڵ بووین بەڵام تەرکی حوکمیان کرد !

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (النور:٤٨). واتا: کاتێك بانگ بکرێن بڵێن: ئەی مونافیقان وەرن بۆ لای اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ تا حوکم و بڕیار لە نێوانتاندا بدەن کۆمەڵێك لەوان پشت لە حەق ئەکات ، یاخود لە حوکم هێنان بۆ لای اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ.

ئیمامی طەبەڕی دەربارەی ئەو ئایەتە ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ دەڵێ: (وَإِذَا دُعِيَ هَؤُلَاءِ الْمُنَافِقُونَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ فِيمَا اخْتَصَمُوا فِيهِ بِحُكْمِ اللَّهِ ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ عَنْ قَبُولِ الْحَقِّ ، وَالرِّضَا بِحُكْمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) (تفسير الطبري(ج:١٩/ص:٢٠٥) واتا: کاتێك ئەو دووڕووانە بانگ دەکرێن بۆ لای قورئان و رسول اللَّه ﷺ تا حوکم و بڕیار لە نێوانیاندا بدەن، بەحوکمی اللَّه تعالى لەوەی کە ناکۆکیان تێیدا هەیە ، کۆمەڵێك لەوان پشت لە حەق ئەکات، حەق قەبووڵ ناکەن وەڕازی نابن بەحوکمی رسول اللَّه ﷺ.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (النور: ٥١). واتا: كاتێك كە باوەڕداران بانگ بكرێن بۆ لای اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ بۆ ئەوەی بڕیار لە نێوانیاندا بدات، واتە: بۆ لای قورئان و سوننەت تەنها وتە یەك هەیان بێت ئەوەیە ئەڵێن: ئێمە فەرمان و فەرمایشتی اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ بیست وە گوێڕایەڵین ئا ئەم كەسە باوەڕدارانە سەرفرازو سەركەوتوون لە دونیاو قیامەتدا.

جا سەرنج بدە ئەو ئایەتان بەڵگەن بۆ كوفری پشت هەڵكردن و كوفری پشتێكەر لەكردەوە پێكردنی، وە تەركردنی كردەوە پێكردن و گوێڕایەڵ نەبوونی ئیمان ناهێڵێ، وە پشتهەڵكردن پەیوەندی هەیە بەحوكم كردن بەشەریعەت و ئەوەی اللَّه تعالى داییەزاندووە، وە بەتەنخا پشتكردن لەحوكمی اللَّه تعالى نیفاقی گەوریەو دەرخەرە لەدین.

ابن تيمية دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێ: (فبَيَّنَ سُبحانَه أنَّ من تولَّى عن طاعةِ الرَّسولِ، وأعرض عن حُكْمِه؛ فهو من المنافقين وليس بمؤمن، وأنَّ المؤمنَ هو الذي يقولُ: سَمِعْنا وأطَعْنا، فإذا كان النِّفاقُ يَثْبُتُ، ويزولُ الإيمانُ بمجَرَّدِ الإعراضِ عن حُكم الرَّسولِ وإرادةِ التحاكُم إلى غيره، مع أنَّ هذا تَرْكٌ مَحْضٌ، وقد يكونُ سَبَبُه قُوَّةَ الشَّهوةِ؛ فكيف بالتنَقُّصِ والسَّبِّ) (الصارم المسلول على شاتم الرسول(٣٨ _١/٣٧)). واتا: اللَّه تعالى ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوەی لابدات لەگوێڕایەڵی رسول اللَّه ﷺ وە پشتی تێبکات، ئەوا لە دووڕووانە و ئیماندار نییە، لەبەر ئەوەی موسڵمان ئەوەیە کەدەڵێت: گوێمان گرت و گوێڕایەڵ بووین، جا ئەگەر دووڕوویی جێگیر بوو، وە ئیمان لادەچێت تەنها بەپشت کردن لە حوکمی رسول اللَّه ﷺ و ویستنی حوکم گێڕانەوە بۆ لای جگە لەو، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە ئەو وازهێنانەی حوکمی رسول اللَّه ﷺ بەهۆی بەهێزی ئارەزووەوە بێت، ئەی چی بە کەم کردنەوەی ئەو حوکم و جنێو پێدانی؟ .

اللَّه تعالى دەفەرموویت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنْذِرُوا مُعْرِضُونَ ﴾ (الأحقاف:٣).

واتا: کافران و بێباوەڕان لەو ئاگادارکردنەوەو ترساندنەی کە کراون لە قورئانی پیرۆزدا ئەوان پشتی تێ ئەکەن.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (الأنفال:٢٣). واتا: ئەگەر وایشی لێ بکردنایە کەحەق ببیستن هەر پشتیان هەڵدەکردەوەو سوودیان لێ نەئەبینی وە پشتیان هەڵئەکرد.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (لأنبياء:٢٤). واتا: تەنها باسی یەکخواپەرستیان تیا کراوە بەڵکو زۆربەیان نەزانن وە حەق ناناسن وە حەق نازانن وە ئەوان پشت ئەکەن لە حەق و لە وەرگرتنی حەق و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی خوا ﷺ.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء:٣٢). واتا: لە کاتێکدا ئەمان پشت لە ئایەتەکانی اللَّه تعالى ئەکەن.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء:١). لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت لە خەڵکی نزیك بۆتەوە لە کاتێکدا خەڵکی بێئاگان لەبەر ئەوەی سەرقاڵی دونیان و پشتیان کردووە لە قیامەت و خۆیان بۆ ئامادە نەکردووە.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿بَلْ هُمْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِمْ مُعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء:٤٢). بەڵکو ئەوان پشت ئەکەن لە بەڵگەو ئایەتەکانی اللَّه تعالى.

اللَّه تعالى دەفەرموويێت: ﴿بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَنْ ذِكْرِهِمْ مُعْرِضُونَ﴾ (المؤمنون:٧١). واتا: بەڵكو ئێمە شتێكمان بۆ هێناون كە قورئانە يادیان ئەخاتەوە، یاخود ڕێزو پلەو پایەی ئەوانی تیایە ئەگەر شوێنی بكەون بەڵام ئەوان پشتی تێ ئەكەن.

اللَّه تعالى دەفەرموويێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (آل عمران:٢٣). واتا: ئایا نابینی ئەوانەی بەشێك لە كتابیان وەرگرتووەو زانیاریان هەیە كاتێك كە بانگ ئەكرێن بۆ لای كتابەكەی اللَّه تعالى بۆ ئەوەی كە حوكم و بڕیار لە نێوانیاندا بدات پاشان كۆمەڵێك لەوان پشت هەڵئەكەن و ئەڕۆن و ڕوو وەرئەگێڕن .

اللَّه تعالى دەفەرموويێت: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ﴾ (المدثر: ٤٩) واتا: ئەوە ئەوان چیانە بۆچی لەم یادخستنەوەیە پشت هەڵئەكەن و پشت لە قورئان ئەكەن و ئەڕۆن.

اللَّه تعالى دەفەرموويێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنْتَقِمُونَ﴾(السجدة:٢٢) واتە: كەس لەو كەسە زاڵمترو ستەمكارتر نیە كە ئایەتەكانی اللَّه تعالى یاد ئەخرێتەوە پاشان ئەو لە جیاتی ئەوەی باوەڕی پێ بێنێت پشتی تێ ئەكات بە دڵنیاییی ئێمە تۆڵە لەو كەسە تاوانبارانە ئەسەنین.

## بەڵگە لەسەر کافربوونی کەسێك بەهۆی إستحلال کردنی یەك کردەوە و بێ ئەوەشی بیداتە پاڵ الله:

ئەڵێن: تەبدیلی شەریعەت (تحليل و تحريم) کاتێك ئەبێتە کوفری گەورە ئەگەر تەبدیلەکە بداتە پاڵ الله تعالى یان تەعطیل کردنی شەرع نابێتە کوفری گەورە ئەگەر خۆی بە تاوانبار زانی یان شەرعی الله تعالى ی پێ باشتر بوو, هەموو ئەم قسانەش هەڵبەستراوەو وەهیچ سەلەفێکیان نییە بۆ ئەم قسانە، جا إستحلال بە فعل و قول و إعتقاد ڕوودەدات, بۆ هیچ یەکێك لەمانەش بە مەرج دانەنراوە کە ئەبێت إستحلالەکە بداتە پاڵ الله تعالى ئینجا کافر ئەبێتەوە, بەڵکو هەرکەسێك حەرامێکی حەلاڵ کرد یاخود حەلاڵێکی حەرام کرد ڕاستەوخۆ کافر ئەبێتەوە جا بیداتە پاڵ الله تعالى یان نەیداتە پاڵ الله تعالى , وە بەهەمان شێوەش هەرکەسێك کار بەم إستحلال و إستحرامە بکات کافرە جا بیداتە پاڵ الله یان نەیداتە پاڵ الله یانیش با هەزار جار خۆی بە تاوانبار بزانێت, چونکە لە حەدیثەکەی عەدی باسی موشریك بوونی ئەو کەسانە ئەکات کە کار بە إستحلال و إستحرامی أحبار و رهبانەکان ئەکات , جا ئەمانەشی کە گوێڕایەڵی زانا و عابیدەکانیان ئەکرد لە إستحلال وإستحرامەکە نەیان ئەدایە پاڵ الله, کە حەدیثەکە زۆر ڕوونە و شوبهەکەیان بەتاڵ ئەکاتەوە .

جا باسی کافربوونی ئەو کەسە ئەکەین بەهۆی إستحـلال کردنی یەك فعل ـەوە , ئەگەرچی نەشیداتە پاڵ الله تعالی:

إبن تیمـیة دەڵێ: (حَدِيثُ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ لَمَّا بَعَثَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إلَى مَنْ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ فَأَمَرَهُ أَنْ يَضْرِبَ عُنُقَهُ وَيُخَمِّسَ مَالَهُ فَإِنَّ تَخْمِيسَ الْمَالِ دَلَّ عَلَى أَنَّهُ كَانَ كَافِرًا لَا فَاسِقًا وَكُفْرُهُ بِأَنَّهُ لَمْ يُحَرِّمْ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ)). (مجموع الفتاوی : ٩٠/٢٠) واتا: لە حەدیثەکەی أبو بردة ـی کوڕی نیار هاتووە کەوا کاتێك پێغەمبـەر ﷺ ناردی بۆلای کەسێك کە زەواجی لەگەڵ ژنی باوکی کردبوو (زڕ دایکی) فەرمانی پێ کردبوو کە لە گەردەنی بدات و ماڵەکەشی تخمـیس بکات و بیهێـنێتەوە بۆ بیت المال, جا لێرەدا تخمیس کردنی ماڵەکەی بەڵگـەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسە بەهۆی ئەم کارەیەوە کافر بوو نەوەك فاسق , وە کوفرەکەشی بریتی بوو لەوەی کە ئەو شتەی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی ﷺ حەڕامیان کردبوو ئەو بە حەڕامی دانەنابوو.

عبداللەی کوڕی ئیمامی ئەحمەد دەڵێ: (سَأَلتُ ابي عَنْ حَدِيث النَّبي ﷺ أنَّ رَجُلًا تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبيه فَأمرَ النَّبي ﷺ بقتْله واخذ مَاله قَالَ أَبي نَرى وَالله اعْلَم أَنَّ ذَلِك مِنْهُ على الاسْتِحْلال فَأَمرَ بِقَتْله بِمنْزِله واخذ مَا لَهُ) (مسائل الإمام أحمد : ١٢٩٥) واتا: پرسیارم لە باوکم کرد لەبارەی حەدیثەکەی پێغەمبەر ﷺ کاتێك پیاوەکە هاوسەرگیری کردبوو لەگەڵ خێزانی باوکی , پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی دەرکرد بە کوشتنی و بردنی ماڵەکەی؟ باوکیشم (واتە : ئیمامی أحمد) فەرمووی: وای دەبینین, والله أعلم کە ئەم کەسە ئەو کارەی بە حەڵاڵ زانی بوو, بۆیەش فەرمانکرا بە کوشتنی هەر لەناو ماڵەکەی خۆی و بە بردنی ماڵەکەی.

ئیمامی ابن جەریر دەڵێ: (إنَّ الَّذي أَمرَ عَلَيْه السَّلاَمُ بضَرْب عُنُقه، لَمْ يَكُنْ أمرًا بضَرْب عُنُقَهُ عَلَى إتْيَانه زَوْجَةَ أَبيه فقَطْ دُونَ مَعْنًى غَيرْهُ، وَإنَّمَا كَانَ لإتْيَانه إيَّاهَا بعَقْد نكَاح كَانَ بَيْنَهُ وبَيْنَهَا وَذَلك مُبيّنٌ في الْأَخْبَار الَّتي ذَكَرْتُهَا قَبْلُ، وَذَلكَ قَوْلُ الرَّسُول الَّذي أَرْسَلَهُ رَسُولُ اللَّه ﷺ إلَى الَّذي فَعَلَ ذَلكَ للْبَرَاء إنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ أرْسَلَني إلَى رَجُل تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبيه لأَضْربَ عُنُقَهُ وَلَمْ يَقُلْ: إنَّهُ أَرْسَلَني إلَى رَجُل زَنَى بامْرَأَة أَبيه لأَضْربَ عُنُقَهُ وَكَانَ الَّذي عَرَّسَ بزَوْجَة أَبيه، مُتَخَطِّيًا بفعْله حُرْمَتَيْن، وَجَامعًا بَيْنَ كَبيرَتَيْن منْ مَعَاصي اللَّه إحْدَاهُمَا: عَقْدُ نكَاح عَلَى مَنْ حَرَّمَ اللَّهُ عَقْدَ النِّكَاح عَلَيْه بنَصِّ تَنْزيله بقَوْله: ﴿وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ منَ النِّسَاء﴾ [النساء: ٢٢] وَالثَّانيَةُ: إتْيَانُهُ فَرْجًا

مُحَرَّمًا عَلَيْهِ إِتْيَانُهُ وَأَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ تَقَدُّمُهُ عَلَى ذَلِكَ بِمَشْهَدٍ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ، وَإِعْلَانُهُ عَقْدَ النِّكَاحِ عَلَى مَنْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ عَقْدَهُ عَلَيْهِ بِنَصِّ كِتَابِهِ الَّذِي لَا شُبْهَةَ فِي تَحْرِيمِهَا عَلَيْهِ، وَهُوَ حَاضِرُهُ. فَكَانَ فِعْلُهُ ذَلِكَ مِنْ أَدَلِّ الدَّلِيلِ عَلَى تَكْذِيبِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِيمَا أَتَاهُ بِهِ عَنِ اللَّهِ تَعَالَى ذِكْرُهُ، وَجُحُودِهِ آيَةً مُحْكَمَةً فِي تَنْزِيلِهِ) (تهذيب الآثار : ٦ / ٤٥٦-٤٥٧) واتا: ئەو کەسەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی سەر بڕینی بۆ دەرکرد, تەنها لەسەر هێنانی خێزانی باوکی نەبوو کە فەرمانی سەر بڕینی بۆ دەرکرا و هیچ مانای تر لەخۆی نەگرێت , نەخێر بەڵکو هێنانی ئەو زڕ دایکەی بۆ خۆی لەڕێگەی بەستنی عەقدی نیکاح بوو لەنێوان خۆی و ئەودا, ئەمەش ڕوون کرایەوە لەو خەبەرانەی کە لەپێشوودا باسم کرد, وە ئەوەش قسەی ئەو کەسەیە کە رسول اللە ﷺ ناردی بۆلای ئەو کەسەی کە ئەم کارەی کردبوو کە ئەڵێت: رسول اللە ﷺ ناردمی بۆلای پیاوێك کە زەواجی لەگەڵ ژنی باوکی کردبوو تاوەکو سەری ببڕم ؛ نەیفەرموو : منی نارد بۆلای پیاوێك تاوەکو سەری ببڕم بەهۆی ئەوەی زینای کردووە لەگەڵ زڕ دایکی، وە ئەو کەسەشی کە زڕ دایکی خۆی هێنابوو بەهۆی ئەم فعلـەیەوە سنووری دوو حەڕامی بەزاندووە , وە دوو گوناهی گەورەی لەخۆی کۆکردبوویەوە لە سەرپێچی کردنی اللە تعالی؛ یەکەمیان: بەستنی عەقدی نیکاح بوو لەگەڵ ئەو کەسەی کە اللە تعالی ئەم جۆرە عەقدی نیکاحەی بە نەص حەڕام کردووە لەسەری کە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ﴾ دووەم: هێنانی داوێنـێکی حەڕام کراو بوو لەسەری , وە

لەمەش گەورەتر ئەوەیە کە ئەم کەسە ئەو کارەی ئەنجامدا لەکاتێکدا رسول الله ﷺ لە ژیاندا بوو , وە إعلانی عەقدی نیکاحێکیشی کرد کە الله تعالی ئەم جۆرە عەقدەی حەڕام کردووە بە نەص لە کتێبەکەیدا کە هیچ شوبهەیەکیش هەڵناگرێت لەسەر حەڕامیەتیەکەی, وە خۆیشی لە ژیاندایە, کەچی ئەم کارەی ئەنجامدا, ئەمەش بەهێزترینی بەڵگەیە لەسەر بەدرۆخستنەوەی رسول الله ﷺ لەو پەیامەی کە پێی هاتووە لەلایەن الله تعالی ـەوە کە باسیشی لێوە کراوە, وە نکۆڵی کردنی ئایەت موحکەمە لەو کتێبەی کە دایبەزاندووە.

جا دەپرسین ئایە ئەو کەسەی کە ئەو کارەی ئەنجامدا کارەکەی دایە پاڵ الله ؟ ئایە ئەو استحلال کردنەی بریتیبوو لەکوفری بچووك ؟

جا شوبهەیەك دێننەوە دەڵێن: تاوەکو ئەو حکم بغير ما أنزل اللّٰه ـیە نەدرێتە پاڵ اللّٰه تعالی، ئەوە پێی لەدین ناچێتە دەرەوە، جا بەڵگەیان بۆ ئەمە وتەی سەلەف دەهێننەوە. ئایە سەلەف گوتویانە ئیلا بیداتە پاڵ اللّٰه تعالی ئینجا پێی بێباوەڕ دەبێت ؟

لەوەڵامدا دەڵێین: بێگومان دوو جۆر حوكم بغير ما أنزل اللّٰه ـەمان هەیە:

یەکەم: لە یاسادانانی وڵاتێکدا حوكمێك مطابقی شەریعەت بوو بەڵام لە جێبەجێ کردنیدا کەم و کوڕی هەبێت ، بۆ نمونە: لە یاسای وڵاتەکە دەستی دز حوکمەکەی بڕیتییە لە بڕین، بەڵام لە جێبەجێکردنیدا جار جارە لەبەر خزمایەتی یان شتێکی تر جێبەجێی ناکات.

دووەم: لە یاسادانانی وڵاتێکدا حوكمێك موخالفی شەریعەتی ئیسلامە و پێچەوانەی شەریعەت دانراوە، بۆ نمونە: دەڵێن ئێمە بەهیچ شێوەیەك دەستی دز نابڕین.

جا ئەوەی یەکەمیان کە کەمو کوڕی هەیە لەحوکمدا یان موخالفەی حوکمەکە دەکات ئەگەر نەیداتە پاڵ اللّٰه تعالی و خۆی بە تاوانبار زانی ئەوە پێی بێباوەڕ نابێتەوە،

بەڵام ئەگەر دایە پاڵ اللّٰه تعالی ئەوا پێی بێ باوەڕ دەبێتەوە.

بەڵام ئەوەی دووەمیان ئەگەر بیداتە پاڵ اللّٰه تعالی یان نەیداتە پاڵ اللّٰه تعالی ئەوە هەر بێباوەڕەو لەدین دەرچووە.

جا شوبهەچیەکان دەڵێن: ئەگەر بە تەواوەتیش تەرکی کرد و حوکمی پێ نەکرد و لە یاسادانانیش تەعطیلی بکات بەڵام نەیداتە پاڵ اللَّه تعالی ئەوە پێی بێباوەڕ نابێ، پەنا بە اللَّه تعالی ئەمە گومڕاییەکی ئاشکراو و سەرلێشێواویەکی زۆر ڕوونە، مەگەر ئەوە عەقیدەی مورجیئەکان بێت، ڕاستە سەلەف گوتویانە ئەگەر بیداتە پاڵ اللَّه تعالی ئەوە بێباوەڕ بۆتەوە، بەڵام ئەم قسەیان لەسەر جۆری یەکەمە چونکە حاکمەکانی زەمانی زانایان و سەلەف ئەصڵی یاسادانانیان لە ئیسلامەوە وەرگرتووە، بەڵام لە جێبەجێ کردنیدا کەمتەرخەمیان هەبووە، کەواتە پێی بێباوەڕ نەدەبوونەوە .

جاگریهان ئەگەر لەسەر جۆری دووەمی حکم بغير ما أنزل اللَّه ـــش کردبێتیان ئەمە مانای ئەوە نییە تەعطیلی ئەمرێك لە ئەمرەکانی اللَّه تعالی ئەگەر نەتدایە پاڵ اللَّه تعالی ئەوە بێباوەڕ نابێتەوە پێی، بەڵام ئەگەر حوکمێکی تەعطیل کرد و نەیدایە پاڵ اللَّه تعالی ئەمە بێباوەرە بێگومان، (دەشی سەلمێنین بەوتەی سەلەف) بەڵام ئەگەر تەعطیلی کرد و پەکیخست دایە پاڵ اللَّه تعالی ئەمە کوفرکەی ڕوونە و دەرچوونە لەمیللەت.

جا ئێمە لێرەدا بە دوو شێواز ئەم شوبهەیەیان وەڵام ئەدەینەوە :

یەکەم: یاسق و هاوشێوەکانی حوکم کردن بە شەرائیعی منسوخ .

دووەم: بەڵگەی سەلەف لەسەر وازهێنان لە جێبەجێ کردنی ئەمرێك لەو ئەمرانەی کە اللَّه تعالی داییەزاندووە لە هەموو بوارەکانی دیندا کە ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت و نەشیداتە پاڵ اللَّه تعالی هەر بێباوەرە چجای بگات بە حدود و حوکم.

یەکەمیان: یاسق و هاوشێوەکانی سەرەتا یاسق چییە ؟ یاسق بریتی بوو لەو کتێبەی کە جەنگیز خان پاشای تەتارەکان داینا بۆ بەڕێوەبردنی وڵات ، کە حوکمەکانی ناو کتێبەکە لە چەند سەرچاوەیەکەوە وەرگیرابوو ، لەوانە : (ئیسلام و مەسیحیەت و یەهودییەت و هەواو ئارەزووی جنگیز خان خۆی) کە زانایانی زەمانی دانانی یاسق هەموویان کۆك بوون لەسەر ئەوەی هەرکەس حوکم بکات بە یاسق بێباوەڕ بۆتەوە بەبێگومان، وە دانە پاڵ اللَّه تعالی ـشیان بە هیچ جۆرێك نەدەکردە مەرج بۆ کافر کردنەوەی ئەو حاکمانەی کە حوکمیان بە یاسق دەکرد.

إبن كثير لە تەفسیری ئایەتی: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ (المائدة: ٥٠). لەسەر یاسقی تەتارەكان دەڵێت:) (وكما يَحْكُمُ به التَّتَارُ من السِّيَاسَات الْمَلَكِيَّة الْمأْخُوذَة عَنْ مَلِكِهِمْ جِنْكِزْخَانَ ، الَّذِي وَضَعَ لَهُمُ اليَساق وَهُوَ عِبَارَةٌ عَنْ كِتَاب مَجْمُوع مِنْ أَحْكَام قَد اقْتَبَسَهَا عَنْ شَرَائِع شَتَّى ، مِنَ الْيَهُودِيَّة وَالنَّصْرَانِيَّة وَالْمِلَّة الْإِسْلَامِيَّة ، وَفِيهَا كَثِيرٌ مِنَ الْأَحْكَام أَخَذَهَا مِنْ مُجَرَّد نَظَرِه وَهَوَاهُ ، فَصَارَتْ فِي بَنِيه شَرْعًا مُتَّبَعًا ، يُقَدِّمُونَهَا عَلَى الْحُكْم بِكِتَاب اللَّه وَسُنَّة رَسُوله ﷺ وَمَنْ فَعَلَ ذَلِك مِنْهُمْ فَهُوَ كَافِرٌ يَجِبُ قِتَالُهُ ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى حُكْم اللَّه وَرَسُولِه فَلَا يَحْكُمُ سِوَاهُ فِي قَلِيل وَلَا كَثِير) (تفسیر ابن كثیر ت سلامة (٣/ ١٣١) واتە: هەروەكو چۆن تەتارەكان حوكم دەكەن بەو سیاسەتانەی كە لە پاشاكەیان جەنگیز خانەوە وەریان گرتووە، كە یاسقی بۆ داناون كە عیبارەتە بۆ ئەو كتێبەی كە كۆكراوەی چەند حوكمێك بوو كە لە شەریعەتە جیاوازەكان وەریانگرتبوو، وەك لە یەهودی و مەسیحیەت و ئیسلامیشەوە، وە لەناویشیدا زۆرێك لەو حوكمانە هەبوون كە لە هەواو ئارەزووی خۆیەوە وەریگرتوون ، كە ئەم كتێبە بووەتە شەرعێك كە خەڵكی شوێنی دەكەون و پێشی دەخەن بەسەر حوكم كردن بە قورئان و سوننەتی رسول اللَّه ﷺ (واتە: لە جیاتی قورئان و سوننەت حوكم بەمە دەكەن). جا هەركەسێك ئەم كارەی كرد ئەوا ئەوكەسە كافرە و كوشتاركردنی پێویستە ، هەتاوەكو دەگەڕێتەوە بۆ حوكمی اللَّه تعالى و رسولەكەی ﷺ وە بێجگە لەو حوكم بە هیچی تر نەكات لە زۆر و لەكەم.

وە ابن کثیر کۆدەنگ نەقل دەکات لەوەی هەرکەسێك حوکم بەرێتەوە بۆ شەرعە نەسخ کراوەکان کوفری کردووە، چجای ئەوەی کە حوکم بەرێتەوە بۆ یاسق ! ئیمام ابن الكثير دەڵێ: (فَمَنْ تَرَكَ الشَّرْعِ الْمُحْكَمِ الْمُنَزَّلُ عَلَى مُحَمَّدٍ بْنُ عَبْدِ اللَّه خَاتَمُ الْأَنْبِيَاءِ وتحاكم إِلَى غَيْرِه مِنْ الشَّرَائِعِ الْمَنْسُوخَة كَفَر ، فَكَيْفَ بِمَنْ تَحَاكَمَ إِلَى الياسا وَقَدَّمَهَا عَلَيْه؟ مِنْ فِعْلِ ذَلِك كُفْرٌ بِإِجْمَاعِ الْمُسْلِمِينَ). (البداية وَالنِّهَايَة (١٣/١٣٩) واتا: هەر کەسێك وازبهێنێت لەو شەرعە دادپەروەرەی دابەزێنراوە بۆ سەر محمدی کوڕی عبدالله کۆتا پەیامبەر، وە حوکمی گێڕایەوە بۆ جگە لەشەرعی اللَّه تعالی و حوکمی گێڕایەوە بۆ شەریعەتە نەسخ بووەوەکان و سڕاوەکان ئەوا کافر دەبێت، ئەی چی دەربارەی ئەوەی حوکم بگێڕێتەوە بۆ یاسا و پێشی بخات؟، جا هەر کەسێك ئەو کارە بکات ئەوا بێباوەڕبووە بە یەکدەنگی موسڵمانان.

جا بێگومان و دوو دڵی حوکمەکانی ناو یاسق هیچیان نەدەدرایە پاڵ اللَّه تعالی وە زانایانی سەردەمی یاسق (إبن تیمیة و إبن کثیر و إبن القیم وە غەیری ئەوانەش) شك و گومانیان لەسەر بێباوەڕی ئەوکەسە نەبووە کە حوکم یان تحاکم دەکات بە یاسق.

جا لێرە ئەپرسین بۆچی جەنگیزخان حوکمی بەیاسق کرد و نەشی دایە پاڵ اللَّه تعالی بەڵام هەر بەکافر دانران لەلایەن ئەو زانایە بەڕێزانەوە؟

جا ئەگەر بڵێن: ابن تیمیة و إبن کثیر خەلەفن و گومڕان و قسەکانیان پێچەوانەی سەلەفە، ئەوە دەڵێین: ابن تیمیە زۆر باش لەوە تێگەیشتووە و حوکم نەکردنی جار جارەی لە حوکم نەکردن و تەرکی کوللی جیا کردۆتەوە کە چەندین وتەی هەن لەسەر ئەوەی حوکمێك نەکات پێی کافر نابێتەوە ئەگەر إستحلالی نەکات.

وە لەسەر شەریعەتە نەسخ کراوەکان:

هەروەکو وتەکەی ابن حەزمان هێناوە کە دەڵێ: (أنَّ من حَكَم بحُكمِ الإنجيلِ مِمَّا لم يأتِ بالنَّصِّ عليه وَحيٌ في شريعةِ الإسلامِ، فإنَّه كافِرٌ مُشْرِكٌ خارجٌ عن الإسلامِ). (الأحكام: (١٧٣/٥_١٧٤). واتا: هیچ ڕاجیاییەك نییە لە نێوان دوو کەس لە مسوڵمانان بەوەی هەرکەسێك حوکم بکات بەیاسای ئیینجیل کە لە ئیسلامدا ئاماژەی بەڕاستی ئەوە نەکردبێت ئەوە ئەو کەسە بێباوەڕێکی موشریکە و دەرچووە لە ئیسلام.

هەروەها ابن تیمیة دەڵێ: (نُسَخُ هَذِهِ التَّوْرَاةِ مُبَدَّلَةٌ لَا يَجُوزُ الْعَمَلُ بِمَا فِيهَا وَمَنْ عَمِلَ الْيَوْمَ بِشَرَائِعِهَا الْمُبَدَّلَةِ وَالْمَنْسُوخَةِ فَهُوَ كَافِرٌ) (مجموع الفتاوى (٣٥/٢٠٠) واتا: ئەو تەوراتە گۆڕدراوە و نەسخ کراوەتەوە، جائیز نییە کاربەوە بکرێ کە لە ناویەت ، جا ئەمڕۆ ئەوەی کار بکات بەو شەرعە گۆڕدراوانە یان نەسخکراوانە ئەوە بێباوەڕ بووە.

هەروەها ابن القیم دەڵێ: (أنَّ من التزم ما جاءت به التَّوراةُ والإنجيلُ ولم يتَّبِع القُرآنَ، فإنَّه كافِرٌ، وقد أبطل اللهُ كلَّ شريعةٍ كانت في التَّوراةِ والإنجيلِ وسائرِ المِلَلِ). (أحكام أهل الذمة: (١/٢٥٩). واتا: هەرکەسێك پابەند بێت بەوەی هاتووە لە تەورات و ئینجیلەوە و شوێن قورئان نەکەوێت ئەوا ئەو کافرە، اللَّه تعالى هەموو یاسا و ڕێسایەکی تەورات و ئینجیل و میلەتەکانی تری سڕیوەتەوە.

دەپرسین: ئایە زانایان حوکم کردن بەشەریعەتی نەسخ بۆوە کانیان پەیوەست کرد بە ئیعتیقادەوە ؟ بێگومان نەخێر.

جا ئەگەر دەڵێن: ئەوانە قسەیان وەرناگیرێ پێچەوانەی سەلەف قسە دەکەن، ئەوە نەتانزانی، چونکە هەر ئەو زانایە بەڕێزانەنە کە کۆکن لەگەڵ سەلەف و دەڵێن ئەوەی حوکمێك نەکات بەوەی اللَّه تعالی دایبەزاندووە پێی کافر نابێت ، ئیلا مەگەر نەیداتە پاڵ اللَّه تعالی یان نکوڵی لێ نەکات، بەڵام مەبەستیان لە تەرکی کوللی نەبووە و چاك تێگەیشتوون کە تەرکی کوللی جیایە لە حوکم نەکردن و کەمتەرخەمی جارجار.

یان پرسیارێکتر دەپرسین: ئایا یاسا و دەستورەکانی تر دەدرێنە پاڵ اللَّه تعالی؟ نەخێر نادرێنە پاڵ اللَّه تعالی ئەی بۆچی ئەوەی حوکم بەو یاسایانە بکات بێباوەرە؟ چونکە تەرکی کوللی تێدایە کە لەو یاسایانە دەگوترێت: دوو زیناکەر بە ڕەزامەندی خۆیان زینایان کرد کەس بۆی نییە ڕێگریان لێ بکات بکات، ناشیداتە پاڵ اللَّه تعالی بەڵام بۆ بێباوەرە؟ چونکە تەرکی گوێڕایەڵی ئەمرێك لە ئەمرەکانی اللَّه تعالی کردووە، کەواتە لێرەدا سەلماندمان مەرج نییە ئەوەی حوکمێك لە حوکمەکانی اللَّه تعالی پەك بخات و تەعطیلی بکات ئیللا دەبێ بیداتە پاڵ اللَّه تعالی ئینجا بێباوەڕ دەبێتەوە ، وە ئەگەر بیداتە پاڵ اللَّه تعالی کوفرەکەی دوو بەرامبەرە ڕوونە.

دووەم: بەڵگە قورئانییەکان و فەرموودەییەکان لەسەر ئەوەی کەوا ئیمان وتەو کردارە و وتە بەبێ کردار ئینسان ناکاتە موسوڵمان، هەروەها هێنانەوەی بەڵگە لە سەلەفەوە هاتووە لەسەر ئەوەی کەسێك کە تەرکی تەواوەتی ئەمرێك لە ئەمرە چەسپاوەکانی اللَّه تعالی بکات بێباوەرە، چجای ئەوەی کارکردن تەواوی حوکم پەك بخات !.

هەرکەسێك کردەوە لەئیمان نەزانێ و پێی وانەبێ کە کردەوە لەئیمانە ئەوە ئاوای نابینێ کە ئینسان بەکردەوەی کوفر کافر دەبێ! چونکە وای نابینێ کە ئیماندار ئیمانی هەیە بەکردەوەکەی، بەڵکو بەهۆی وتەوەو بەبێ کردەوە ئیمانی بۆ جێگیر دەکات، بەهەمان شێوە کردەوەکەی، ئەگەر کردەوەی کوفری کرد ئەوە پێی کافر نابێ هەتا بەزمانی دان بەکوفرەکەی دادەنێت ! جا ئەو کەسەی وا بیر بکاتەوە ئەوە بابەتی کوفری لێ تێکچووە، جا ئەوەش دەکەن بەبنچینە! بەپێچەوانەی سەلەف کە پێیان وایە کردەوە ئیمان دادەمەزرێنێت و جێگیری دەکات، جا اللَّه تعالی لەقورئاندا باسی کردوە کە ئیمان بەدەست نایێت ئیلا بەکردەوەی چاکە نەبێت، جا خەریکە هیچ ئایەتێك نەمێنێ کە تێیدا باسی ئیمانی کردووە ئیلا بەکردوەی چاکە بەستیتیەوە؛ اللَّه تعالی دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (البقرة:٢٥، ٨٢، ٢٧٧).

واتا: ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هیناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە.

جا نزیکەی لە پەنجاو دوو شوێندا باسکراوە لەقورئاندا وە هاوشێوەی ئەوەش زۆرە لەقورئاندا.

اللَّه تعالى کاتێك بەڵێنی بەهەشت بەئیماندارن دەدات و موژدەی عاقیبەت باشیان پێدەدات ئیمان و کردەوە بەیەکەوە باس دەکات، وەك چۆن اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ﴾ (النساء:١٢٤). واتا: هەرکەسێک کردەوەی چاك بکات ئەگەر پیاو بێت یان ئافرەت بەو مەرجەی باوەڕدار بێت ئەمانە ئەچنە بەهەشتەوە.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ (النحل:٩٧). واتا: ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە اللَّه بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا﴾ (طه:١٢٢). واتا: ئەوەش کە کارو کردووەوە چاکەکان ئانجام دەدات و لەکاتێکدا ئیمانداریش بووبێت، ئەوە ئیتر ناترسێت لەوەی ستەمی لێ بکرێت یان مافی پێشێل بکرێت.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرموویّت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ﴾ (الأنبياء:٩٧). واتا: هەرکەسێک لە کارو کردەوەی چاکەی کردبێ لە هەمانکاتدا بڕواداریش بێت بێگومان تەقەلاو هەوڵ و تێکۆشانەکانی بەزایە ناچن و ون نابن.

اللَّه تعالى دەفەرموویّت: ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (التغابن:٩). واتا: ئەوەی ئیمان و باوەر بهێنێت بە اللَّه تعالى و کردەوەی چاکیش ئەنجام بدات، ئەوە اللَّه تعالى چاوپۆشی دەکات لە گوناهو هەڵەکانی و دە یخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دە ڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا بۆ هەمیشەو هەتا هەتایی، ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەو بێسنوور.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرموویّت: ﴿وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾ (الإسراء:٩). واتا: مژدەیش دەدات بەو ئیماندارانە ی کە کارو کردەوە چاکەکان دەکەن کە بێگومان پاداشتی زۆرو بێ سنوور چاوەڕێیانە.

هەربۆیە ئیمامی محمدی کوڕی مەروەزی دەڵێ: (كُلُّ آيَة وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ فِيهَا الْجَنَّةَ وَبَشَّرَهُمْ بِهَا فَإِنمَّا أَرَادَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ عَمِلُوا الصَّالِحَاتِ) (تعظيم قدر الصلاة (٥٦٩/٢) واتا: هەموو ئەو ئایەتانەی کە اللَّه تعالی بەڵێن و موژدەی بەهەشتی تێیدا داوە بە ئیمانداران، بەڵکو تەنها مەبەست پێی ئەو ئیماندارانە یە کە کاروکردەوەی چاکەیان کردووە.

جا کەسێك بانگەشەی ئیمان بکات بەدڵ و بەزمانی، وە بەلاشەو ئەندامەکانی کاروکردەوەی نەکردبێت، ئەوە لەتاریکای کوفرەوە دەرنەچووە بۆ نوری ئیمان؛ هەربۆیە اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللَّهِ مُبَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ (الطلاق:١١). واتا: هەروەها پێغەمبەرێك کە ئایەتە ڕوونەکانی اللَّه تعالی ـتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، تا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە لە تاریکیەکان دەریان بهێنێت و ڕزگاریان بکات و بیانخاتە ناو نوورو ڕوناکیەوە، جا ئەوەی باوەڕ بهێنێت بە اللَّه تعالی و کردەوەی چاك ئەنجام بدات، ئەوە دەیخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕوبار بە ژێر درەخت و بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات.

کاروکردەوەی چاکە ئینسان ڕزگار دەکات ئەگەرچی کەمیش بێت و تێکە ڵ بێت بەکاری خراپەوە، وەبەبێ کردەوەی چاکە ڕزگار بوون بەدەست نایەت؛ هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموویت: ﴿وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ (التوبة:١٠٢). واتا: وە کەسانێکی تریش خۆیان دانیان ناوە بە تاوانیاندا کە دواکەوتونە لە غەزاو پەشیمان بوونەتەوەو عوزری درۆیینەیان نەهێناوەتەوە کردەوەی چاك و خراپیان تێکەڵ کردووە، ئەمانە بەدڵنیایی اللَّه تعالی لێیان خۆش ئەبێت.

تەوبە کردن لەکوفر هەردەبێ بە بیروباوەڕو ئیعتیقادی دڵ و وتەی زمان و کاروکردەوەی ئەندامەکان بەدوای خۆی بێنێت؛ هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموویت: ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾ (الفرقان:٧٠). واتا: تەنها کەسانێك ئەگەر تەوبەیان کردبێ لەم تاوانانە وە ئیمانیان هێنابێ وە کردەوەی چاکیان کردبێ، ئەمانە اللَّه تعالی لە دونیادا خراپەکانیان بۆ ئەگۆڕێت بە چاکە، یاخود لە قیامەتدا خراپەکانیان بۆ ئەگۆڕێت بە چاکە.

چونە ناوەوەی کردەوە بۆ ناو ئیمان، وەنەبوون و دروستی ئیمان ئیلا بەکردەوە نەبێت، دینی هەموو پێغەمبەران بووە؛ هەروەکو چۆن اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالنَّصَارَىٰ وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ﴾ (البقرة:٦٢). واتا: بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوە (لە ئوممەتی محمد ﷺ ئەوانەش کە بوونە جوولەکە (شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی موسان)، گاورەکانیش (کە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی عیسان)، (صابئە)ش کە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی داودن)، ئەوانە هەر دەستەیەکیان باوەڕی دامەزراوی هێنا بێت بە اللَّه تعالى و ڕۆژی دوایی و کارو کردەوەی چاکەی ئەنجام دابێت، جا ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە.

ئا بەو شێوەیە هەرکاتێك ئیمان باسکرا بێت، بەستراوەتەوە بەکردەوە بەچەند دەستەواژەی جیاواز:

جارێك بەستراوەتەوە بەتەقوا، مەبەستیش پێی: کردەوەی فەرمان پێکراوەو وازهێنانە لەشتی ڕیگە پێنەدراو؛ هەروەکو لەوتەی اللَّه تعالى هاتووە دەفەرموویێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ خَيْرٌ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (البقرة:١٠٣). واتا: بەڵام ئەگەر بهاتایە ئیمانیان بهێنایە و ، وە تەقوای اللَّه تعالى ـیان بکردایە ئەوە اللَّه ئەجرو پاداشتی یەکجار زۆری ئەدانەوە ئەمیان بۆیان باشتر بوو لە دونیاو قیامەتدا ئەگەر بیانزانیایە.

وەجارێك بەستراوەتەوە بەئیسلام؛ مەبەستیش پێی: خضوع و ملکەچ بوونە بەکردەوەی دیارو ئاشکرا، هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموویٚت: ﴿قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ﴾ (آل عمران:٨٤). واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئێمە ئیمانمان هێناوە اللَّه وە بەوەی کە بۆ ئێمە دابەزیوە کە قورئانی پیرۆزە وە ئیمانمان هێناوە بەو کتێبانەی کە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل.

پاشان اللَّه تعالی دەفەرموویٚت: ﴿وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ (آل عمران:٨٤). واتا: ئێمە خۆمان تەسلیمی اللَّه تعالی کردووەو موسڵمان و ملکەچی اللَّه تعالی ـین. وە هاوشێوەی ئەوە اللَّه تعالی دەفەرموویٚت: ﴿فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ (البقرة:١٣٧). واتا: ئەگەر ئەهلی کتابیش لە جوولەکەو گاور ئیمان بێنن وەك ئەم ئیمانەی ئێوەی هاوەڵان ئەوە بەڕاستی هیدایەتیان وەرگرتووە بەڵام ئەگەر پشتیان هەڵکردو ئیمانیان پێ نەهێنا ئەوە ئەوان لە موخالەفەو سەرپێچی و عینادیدان. جا پشتهەڵکردن لەکردەوەی دیارەوەیە کە بریتییە لەتەرککردنی تەسلیم بوونی کردەوە ئەندامییەکان و ملکەچ نەبوونی.

لەسەرەتای دەعوەدا خەڵکی ئەمریان پێدەکرا بەوتنی دوو شەهادەکەو داننان بەزمانیان، لەوکاتەدا هیچ فەرزێکی نوسراو لەسەریان نەبوو؛ جا بەوە ناویان لێدەنرا ئیماندار، پاشان کە شەریعەت هات بەکردەوەی لاشەو ئەندامەکان، ئەوانە قسەیان لەگەڵ کرا بەناوی ڕاستەقینەی دروستی خۆیان: هەروەکو اللَّه تعالى دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا﴾ (النساء:١٣٦). واتا: ئەی باوەڕداران ئیمان بێنن بە اللَّهو رسولەکەی ﷺ واتە: دامەزراو بن لەسەر ئیمانەکەتان وە بەردەوام بن لەسەری. ئەوەش وتەی هەریەك لەو زانایانەیە: ابن عيينة، أحمد بن حنبل، جگە لەو دوانەشە.

ابن عيينة دەربارەی ئەوەی وانیشان دەدات کە ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە، دەفەرمووێت: (كَانَ الْقَوْلُ قَوْلَهُمْ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ أَحْكَامُ الْإِيمَانِ وَحُدُودُهُ) (الشريعة للآجري (٥٥٣/٢) واتا: وتە وتەی ئەوان بوو (دەربارەی) ئیمان پێش ئەوەی حوکمەکانی ئیمان و سنورەکانی دابەزێت.

اللَّه تعالى ناوی لەو کەسە ناوە پشتهەڵکەر و ڕوووەرگێڕ کە وانیشان دەدات بیرباوەڕ تەنها وتەیەو ملکەچ نەبووە بۆئەرکانەکان بەکردەوە؛ هەروەکو چۆن دەفەرموویێت: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ٣٢ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ (آل عمران:٣١-٣٢). واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن اللَّه ـتان خۆش ئەوێ ئەوە شوێن من بکەون ئەوە ئەو کاتەش اللَّه ئێوەی خۆش ئەوێ وە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێ، اللَّه تعالى زۆر لێخۆشبوو و بەڕەحم و بەزەییە.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ (آل عمران:٣٢). واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی اللَّه تعالى پاشان رسول اللَّه ﷺ بکەن ئەگەر پشتیان هەڵکرد لە گوێڕایەڵی اللَّه تعالى پاشان رسول اللَّه ﷺ ئەوە اللَّه تعالى کافرانی خۆش ناوێ.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (آل عمران:٢٣). واتا: ئایا نابینی ئەوانەی بەشێك لە کتابیان وەرگرتووەو زانیاریان هەیە کە زانایانی جوولەکەن کاتێك کە بانگ ئەکرێن بۆ لای کتابەکەی اللَّه تعالى بۆ ئەوەی کە حوکم و بڕیار لە نێوانیاندا بدات، یان بۆلای کتابەکەی خۆیان کە موژدەی هاتنی رسول اللَّهی ﷺ تێدایە پاشان کۆمەڵێك لەوان پشت هە ڵئەکەن و ئەڕۆن و روو وەرئەگێڕن.

اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ (المائدة:٩٢). واتا: وە ئێوە گوێڕایەڵی اللَّه تعالى پاشان رسول اللَّه بکەن ﷺ وە ئاگادار بن لەسەرپێچی کردنی گوێڕایەڵی اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ ئەگەر پشت هەڵکەن لەگوێڕایەڵی اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ ئەوە بزانن تەنها پێغەمبەرەکەی ئێمە گەیاندنێکی ئاشکرای لەسەرە، واتە: هەڕەشەیە ئەگەر سەرپێچی گوێڕایەڵی اللَّه تعالى و رسول اللَّه بکەن ﷺ ئەوە اللَّه تعالى سزاتان ئەدات.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ (النور:٥٤). واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی اللَّه تعالى و رسول اللَّه بکەن ﷺ (واتە: شوێن قورئان و سوننەت بکەون) وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوە رسول اللَّه ﷺ تەنها گەیاندنی دینەکەی لەسەرە کە بە جوانترین و تەواوترین شێواز جێبەجێی کردووە وە ئێوەش لێپرسینەوەتان لەگەڵدا ئەکرێ لەسەر ئەو ئەرکەی لەسەر شانتانە کە گوێڕایەڵی کردن و ئیمان هێنانە وە ئەگەر بێتوو ئێوە گوێڕایەڵی رسول اللَّه بکەن ﷺ ئەوە هیدایەت وەرئەگرن و دێنە سەر رێگای راست وە هیچ شتێکیش لەسەر رسول اللَّه نییە ﷺ تەنها گەیاندنێکی ئاشکرا نەبێ کە دینەکەتان پێ بگەیەنێت.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿فَإِنْ تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِنْ تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ (الفتح:١٦). واتا: ئەگەر لەم شتەدا ئێوە گوێڕایەڵی اللَّه تعالى بکەن و جیهاد بکەن ئەوە اللَّه تعالى ئەجرو پاداشتێکی باشتان ئەداتەوە لە دونیادا بەسەرکەوتن و غەنیمەت لە قیامەتیش بە بەهەشت وە ئەگەر پشتیش هەڵکەن هەروەکو چۆن لە پێشتردا لە (حودەیبیە) پشتان هەڵکرد وە ئامادە نەبوون ئەوە اللَّه سزاتان ئەدات سزایەکی زۆر بەئێش و ئازار لە دونیا بە تێکشکاندن لە قیامەتیش بە ئاگری دۆزەخ.

هەروەها اللَّه عزوجل دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنْتُمْ تَسْمَعُونَ﴾ (الأنفال:٢٠). واتا: ئەی باوەڕداران ئێوە گوێڕایە ڵی اللَّه پاشان رسول اللَّه بکەن ﷺ وە ئێوە پشت لە رسول اللَّه ﷺ مەکەن و سەرپێچی مەکەن کاتێك کە بانگتان ئەکات و ئێوە ئەبیستن و ئەزانن بۆچی بانگتان دەکات.

هەروەها اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَأَسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (الأنفال:٢٣). واتا: ئەگەر اللَّه بیزانیایە خێر لەمانەدا هەیە ئەوە وای لێ ئەکردن کە ببیستن بیستنێك کە سوودیان پێ بگەیەنێ وە ئەگەر وایشی لێ بکردنایە کەحەق ببیستن هەر پشتیان هە ڵدەکردەوەو سوودیان لێ نەئەبینی وە پشتیان هەڵئەکردو ئەڕۆیشتن اللَّه تعالی ئەیزانی کە ئەوانە ئیمان ناهێنن و زانیاری هەبوو.

بەهەمان شێوە اللَّه تعالى باسی پشت هەڵکردن و إعراض دەکات لەموقابیل و بەرامبەری تەسلیم بوون و کردەوە کردن:

لەوانە: وتەی اللَّه تعالى ﴿فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ (التوبة:٧٦). واتا: جا کاتێک اللَّه تعالى لە فەزڵ و بەرەکەتی خۆی پێیدان و بەهرەوەری کردن، ئەوان ڕەزیلیان تێدا کردو پشتیان لە بەڵێنەکەیان کرد لەکاتێکدا کە ئەوان هەمیشە لە بەڵێن و پەیمان پشت هەڵکەرن.
اللَّه تعالى باسی پشتهەڵکردنی کرد لەبەرامبەر تەسلیم بوون بۆ اللَّه تعالى و ملکەچ بوون بۆی بە ئەندامەکانی لاشە.

اللَّه تعالى دەفەرموویێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ * فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ (النحل:٨١- ٨٢). واتا: ئابەم شێوازە اللَّه تعالى نیعمەتەکانی خۆی تەواو دەکات بەسەر ئێوەدا بەڵکو تەسلیم و ملکەچی فەرمانی اللَّه تعالى ببن.
ئەگەر پشتیان هەڵکردو موسڵمان نەبوون ئەوەی لەسەر تۆیە ئەی محمد ﷺ تەنها ڕاگەیاندنێکی ئاشکرایە کە دینەکەی اللَّه تعالى ـت گەیاندووە.

هەروەها اللَّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَهَلْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ * فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنْتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۖ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَمْ بَعِيدٌ مَا تُوعَدُونَ﴾ (الأنبياء:١٠٨- ١٠٩). واتا: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من تەنها وەحیم بۆ دێت لەلایەن اللَّه تعالى وە کە پەرستراوی ئێوە تەنها یەك پەرستراوێکە تاك و تەنهاو بێ شەریکە کە زاتی پیرۆزی اللَّه یە ئایا ئێوە ملکەچن بۆ عیبادەت و پەرستنی اللَّه تعالى بەتاك و تەنها واتە: ملکەچ بن و وابن.

ئەگەر پشتیان هەڵکرد لە ئیسلام و باوەڕیان نەهێنا [ئەوە پێیان بڵێ من ئاگادارم کردنەوە بە یەکسانی کەسم لێ بێبەش نەکردووە لە هەندێکی بشارمەوە بەڵکو بە هەمووتانم ڕاگەیاندووە، یاخود پێم ڕاگەیاندن کە چۆن ئێوە لە من بەرین منیش لە ئێوە بەریم، چۆن ئێوە جەنگی من دەکەن منیش جەنگی ئێوە دەکەم وە من نازانم ئەوەی کە هەڕەشەتان پێکراوە لە سەرکەوتنی ئیسلام و دۆڕاندنی ئێوە بەم نزیکانە جێبەجێ ئەبێ یان دوورە، یاخود لە ڕۆژی قیامەت ئێوە سزای خۆتان وەرئەگرن یان لە دونیا سزا دەدرێن.

اللَّه تعالی جیاوازی کردووە لەنێوان ئەوبەدرۆخستنەوەی کەبەدڵ و بەزمانە وە لەنێوان پشتهەڵکردن کەبەهۆی نەکردنی ئەندامەکانی لاشەیە؛ هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (طه:٤٨). واتا: بە دڵنیایی ئێمە وەحیمان بۆ هاتووە لەلایەن اللَّه وە کە سزای اللَّه تعالی لەسەر کەسێکە کە ئایەتەکانی اللَّه تعالی و بەڵگەکانی اللَّه بەدرۆ بزانێ وە پشت هەڵبکات لە ئیمان هێنان و وەری نەگرێت.

هەروەها اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى * الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (الليل: ١٥- ١٦). واتا: هیچ کەس ناچێتە ناو ئەو ئاگری دۆزەخەو گەرمی و سزاکەی بچێژێ مەگەر کەسێکی بەدبەخت و خراپەکارو کافرو بێ دین بێت. ئەو کەسەی کە بەدڵ دینی اللَّه تعالی و پەیامی رسول اللَّهو ﷺ قورئانی بەدرۆ زانیوەو باوەڕی پێی نەکردووە، وە بە کردەوەکانیشی پشتی هەڵکردووە لە شوێنکەوتنی رسول اللَّهو ﷺ دینەکەی.

هەروەها اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿ أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (العلق:١٣). واتا: ئایا نابینی (ئەبو جەهل) درۆ ئەکات و پشتی کردووە لە ئیمان هێنان.

هەروەها اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ * وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ (القيامة:٣١-٣٢). واتا: ئەمە سەبارەت بە کەسی بێباوەڕ کە پەیامی اللَّه تعالی و قورئان و زیندووبوونەوەی بەڕاست دانەناوەو باوەڕی پێی نەبووە، وە نوێژی بۆ اللَّه تعالی نەکردووە. بەڵکو رسول اللَّه ﷺ یان قورئان یان ڕۆژی دوایی بەدرۆ زانیوە، وە پشتی کردووە لە گوێڕایەڵی و ئیمان هێنان. سەرنجبدە اللَّه تعالی درۆخستنەوەی لەبەرامبەر بەڕاست دانان دانا، وە پشتهەڵکردنیشی بەرامبەر کردەوە دانا، یانی کەسێك کردەوەی نەبێت پشتی هەڵکردووە لەفەرمانەکانی اللَّه تعالی.

کاتێك اللَّه تعالی باسی ئەمرو فەرمانەکانی خۆی دەکات، وەسفی ئەوەی تەرکی کردەوە پێکردنی دەکات بە پێشتێهەڵکەر کردووە، ئەگەرچی بەوتەش گوێڕایەڵی خۆی دەرخستبێت، اللَّه تعالی حاڵی مونافیقەکانی ڕوونکردۆتەوە لەگەڵ ئەوەش کە بەوتە گوێڕایەڵی خۆیان دەرخستووە، بە ڵام حوکمیانی داوە بەپشتێهەڵکەر، هەروەکو چۆن اللَّه تعالی دەفەرموویێت: ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَا أُولَٰئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٤٧). واتا: مونافیقان ئەڵێن: ئێمەش ئیمانمان بە اللَّه تعالی و رسول اللَّه ﷺ هێناوە وە گوێڕایەڵی اللَّه تعالی پاشان رسول اللَّەمان ﷺ کردووە ئەمە تەنها بە زمان نەك بە کردەوەو بیروباوەڕ لە دوای ئەوە

کۆمەڵێك لەم مونافیقانە پشت هەڵئەکەن لە گوێڕایەڵی اللَّه تعالی و رسول اللَّه ﷺ تا ئەم کەسانە بەڕاستی باوەڕدار نین.
سەرنجبدە اللَّه تعالی نەفی ئیمانی لێکردن و گوتی ئیمانیان نییە، لەبەر إعراض و پشتهەڵکردنیان لەکردەوە لەگەڵ ئەوەش بانگەشەی ئەوەیان کردبوو ئیمانیان هێناوە بەزمان.

پێشینی چاکی ئەو ئوممەتە ئیمان بەکردەوەوە دەبەستنەوە، بەڵکو هیچ یەکێك بەبێ ئەوەی تر دروست نییە نەکردەوە بەبێ ئیمان دروستەو نەئیمانیش بەبێ کردەوە دروستە پشت بەو ئایەتەش دەبەستن: اللَّه تعالی دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ﴾ (البقرة:١٤٣). واتا: صەحابە شانزە مانگ یان حەڤدە مانگ نوێژیان کرد ڕوویان لە (بیت المقدس) بوو دوای ئەوە وتیان: ئەی ئەو شانزە حەڤدە مانگەی کە نوێژمان کردووەو ڕوومان لە (بیت المقدس) بووە، وە هەندێکمان مردوونە،
اللَّه تعالی ئەو ئایەتەی دابەزاند کە اللَّه ئیمانەکەتان نافەوتێنێ واتە: نوێژەکەتان ئەو شانزە حەڤدە مانگەی کە نوێژتان کردووە اللَّه تعالی نایفەوتێنێ وە هەمووی بۆتان نووسیوە.

جا اللَّە تعالی ناوی لە نوێژ نا ئیمان کە کردەوەیەکی لاشەییەو بەئەندامەکان دەکرێت، جا زانایان ئەو ئایەتەیان کردووە بەبەڵگە بەوەی ئیمان وتەو کردارە، لەوانە:

- ئیمامی شافیعی (الإنتفاء لابن عبدالبر (ص:٨١)
- ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (السنة للخلال (١٠٣٤).
- ئیمامی بوخاری فی صحیحه (١/ ١٦- ١٧).

گەورە زانایانی سەلەف دەڵێن ئیمان بەوتە دروست نییە بەبێ کردەوە؛ وەکو:

- سەعیدی کوڕی جوبەیر(شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي:٥٧٨١/١)
- حەسەنی بەصرِی (السنة لعبد الله بن أحمد (ص: ٢٧٦)
- محمدی کوڕی موسلیمی طائیفی (السنة لعبدالله (٧٠٢).
- فوضەیلی کوڕی عیاض (السنة لعبدالله (٧٠٢).
- سوفیانی ثەوری (السنة لعبدالله (٧٠٣).
- سوفیانی کوڕی عویەینه (السنة لعبدالله (٧٣٨).
- محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی عوثمانی کوڕی عفان (السنة لعبدالله (٧١٦).
- ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (السنة للخلال (٩٦٢).
- ئیمامی موزەنی (في شرح السنة (ص:٧٧- ٧٨).
- ئیمامی ئاجوری (الشريعة (٢/ ٦١١).
- ئەبو جەعفەری طەبەرِی (صريح السنة (ص: ٣٥- ٣٦).

ئیمامی شافیعی کۆدەنگی صەحابەو تابیعین ئەوانەی دوای ئەوان نەقڵ دەکات هەروەکو چۆن دەڵێ: (وَكَانَ الْإِجْمَاعُ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ مِمَّنْ أَدْرَكْنَاهُمْ أَنَّ الْإِيمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَنِيَّةٌ، لَا يُجْزِئُ وَاحِدٌ مِنَ الثَّلَاثَةِ بِالْآخَرِ) (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة(٥/ ٩٥٦) واتا: کۆ دەنگی هاوەڵان و تابعین و ئەوانەی پاش ئەوان کەپێیان گەیشتووین لەسەر ئەوە بووە کەئیمان ووتە و کردار و نییەتە هیچ یەکێیکیان بەبێ ئەوی تریان نابێت وە لەیەك ناترازێن ئیللا هەرکات یەکێ لەو سێ دانەیە نەما ئەوانی تریش نامێنن.

هەروەها ابن زيد القيروانيش ئیجماع نەقڵ دەکات (اجتماع الجيوش (ص: ١٥٠- ١٥٢).

هەروەها ابن القطانيش ئیجماع نەقڵ دەکات (الإقناع في مسائل الإجماع (ص: ٣٤).

هەروەها ابن تیمیةش ئیجماع نەقڵ دەکات (مجموع الفتاوى (٦/ ٤٧٩ و ٦٧٢/٧).

وغەیری ئەوانەش ئیجماع نەقڵ دەکەن (سوفیانی ثەوری لەفوقەهایان نەقڵی کردووە سەیری (الإبانة لابن بطة بکە (١٩٠ و ١٠٩٨/ الإيمان)، وذم الكلام (٤٧٨)، وابن عبدالبر لەئەهلی فیقهو حەدیث ئیجماع نەقڵ دەکات سەیری التمهید بکە (٢٣٨/٩).

بەڵگە فەرموودەییەکان دەربارەی ئەوەی ئیمان وتەو کردارە:

رسول اللَّه ﷺ دەفەرمووێت: (أَتَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ الْمَغْنَمِ الْخُمُسَ) (أخرجه البخاري (٥٣). واتا: دەزانن ئیمان بە اللَّه تعالى چییە؟ گوتیان اللَّه پاشان رسولەکەی ﷺ باشتر دەزانن، رسول اللَّه ﷺ فەرمووی: هێنانی شایەتومانە بەوەی هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە بێجگە اللَّه تعالى وە محمدیش ﷺ نێردراوی الله تعالى ـیە وە نوێژکردنەو دانی زەکاتەو ڕۆژی مانگی رەمەزانە وە بەخشینی پێنج یەکی غەنیمەتە.

جا لەو فەرموودەوە بۆمان بەدەرکەوت کە کردەوە بەشێکی دانەبڕاوە لە ئیمان، بەبێ کردەوە ئیمان بوونی نییە.

## بەڵگە لەسەلەفەوە دەربارەی تەرکی حوکم:

یەکەم: لە نافع مولى إبن عمرـەوە کە کوڕەزای ئیمامی عومەرە ( ١١٦ ـی کۆچی وەفات دەکات ) ، (عن معقل بن عبيد الله العبسي أنه ذكر قدوم سالم الأفطس عليهم بالإرجاء ، وأن معقل قدم المدينة فجالس نافع فذكر له بُدُوَّ أمرهم ؛ قال : قلت: إِنَّهُمْ يَقُولُونَ: نَحْنُ نُقِرُّ بِأَنَّ الصَّلَاةَ فَرِيضَةٌ وَلَا نُصَلِّي , وَأَنَّ الْخَمْرَ حَرَامٌ وَنَحْنُ نَشْرَبُهَا، وَأَنَّ نِكَاحَ الْأُمَّهَاتِ حَرَامٌ وَنَحْنُ نَفْعَلُ ذَلِكَ، قَالَ: فَنَتَرَ يَدَهُ مِنْ يَدِي وَقَالَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا فَهُوَ كَافِرٌ) السنة لعبد الله بن أحمد : ٣٨٢/١ ؛ الإبانة لابن بطة : ٨٠٩/٢ ؛ شرح أصول الاعتقاد للالكائي : ٩٥٣/١)). واتا: لە معقلی کوڕی عبیداللە ـی العبسیەوە پیاوێك بە ناوی سالم الأفطس بە ئیرجائەوە دەرکەوت ، وە معقل چووە مەدینە بۆ لای نافع باسی حاڵەتەکەی بۆ نافع دەکات و دەڵێت : بە نافعم وت : ئەوان مورجیئەکان دەڵێن : ئێمە دان بە واجب بوونی نوێژدا دەنێین بەڵام نایکەین ، وە دان دەنێین بە حەڕام بوونی ئارەق بەڵام دەیخۆینەوە ، وە دان دەنێین بە حەڕامی نیکاح کردن لەگەڵ دایکانمان بەڵام دەیکەین ؛ نافع گوتی: هەرکەس ئەوەی کرد ئەوە کافرە. گوتم: سەرنج بدە ئەی ئەو کەسەی شوێن کەوتەی وتەی سەلەفی و بانگەشەی ئەوە دەکەی، ئەوەتا وتەی سەلەف کە هەرکەسێك فەرمانێك لەفەرمانەکانی اللَّه تعالی پەك بخات ئەگەرچی دانیش پێدا بنێ ئەوە هەر بێباوەرە.

جا ئەگەر لای سەلەف کەسێك بڵێت من هەر مەشروب دەخۆمەوە، هەرچەندە دەشزانم حەرامە، پاش تەرك كردنی هەمو فەرمانەكانی اللَّه ئەوە بە بێباوەڕیان دانا بێت، ئەی چۆنە كەسێك كە حەدد وسنورەكانی اللَّه پەك بخات بگوترێت بێباوەڕ نییە !! تێبینیەك لەسەر ئەم وتەیە: ئەگەر كەسێك لەتەواوی تەمەنی مەشڕوب بخواتەوە بەڵام خۆی بەتاوانبار بزانێ و نەیداتە پاڵ اللَّه ئەوە جیایە لەگەڵ ئەو كەسەی كە بەوتە دەڵێ: من دەزانم مەشروب حەرامە بەڵام بەهیچ شێوازێك گوێڕایەڵی ئەو فەرمانەی اللَّه ناكەم، ئێمە مەبەستمان لەوەیە كە بەهیچ جۆرێك گوێڕایەڵی فەرمانی اللَّه ناكات و بڵێ هەر دەیخۆمەوە، نەك ئەو كەسەی مەشروب دەخواتەوە، تەكفیری بكەین، پەنا بە اللَّه ئەمە فكرەی خەواریجەكانە.

تێبینی: لەپێشدا باسمان كرد گوتمان ئەگەر لە تەشریع و دەستوری وڵاتێكدا هەمووی مطابقی شەرع بوو بەڵام لە جێبەجێ كردنیدا جار جارە موخالەفە هەبوو لەبەر ڕیشوە بێت یان خزمایەتی پێی بێباوەر نابێت، ئیلا مەگەر جەحد و ئینكاری بكات یان بیداتە پاڵ اللَّه ئاگاداربە لێرەدا هەندێك لە حكم بغیر ما أنزل اللَّه هەن كە تەنها یەك جاریش بیكەیت ئەگەر خۆشت بە تاوانبار بزانیت هەر بێباوەڕیت و موشریكیت، ئەوانیش بریتین لەو تاوانانەی كە بە نەص بە كوفر ناسێنراون وەك: ئەگەر حاكمێك یەكجاریش یارمەتی بێباوەڕان بدات و سەریان بخات بەسەر موسوڵماناندا پێی بێباوەڕ

دەبێت، ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێ ، یان ئەگەر حاکمێك ڕێگە بدات كە شیرك و كوفر لە وڵاتەكەی ئەنجام بدرێت ئەوە پێی بێباوەڕ دەبێت، ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت ، یان ئەگەر حاكمێك جنێو و سوكایەتی كرد بە شتێكی ئەم دینە پێی بێباوەڕ دەبێتەوە، ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت ، جا ئەمانە هەمووی حكم بغير ما أنزل اللّٰه ـن بەڵام مادام نەصیان لەسەرە جار جاری تێدا نییە یەك جاریش ئەنجام بدرێن هەر كوفرە. واللّٰه أعلم.

دووەم: ئیمامی الأوزاعي (ت١٥٧ە دەربارەی ئەوەی كە ئیمان بەدەست نایێت ئیلا بەكردەوە نەبێت دەڵێ: (فَمَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَعَرَفَ بِقَلْبِهِ , وَصَدَّقَ بِعَمَلِهِ , فَتِلْكَ الْعُرْوَةُ الْوُثْقَى الَّتِي لَا انْفِصَامَ لَهَا , وَمَنْ قَالَ بِلِسَانِهِ , وَلَمْ يَعْرِفْ بِقَلْبِهِ , وَلَمْ يُصَدِّقْهُ بِعَمَلِهِ, لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُ وَكَانَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (الإبانة الكبرى(٢/٣٠٧) واتا: ئەوەی بەزمان ئیمانی هێنا، وە بەدڵی باوەڕی هێنا وە بەكردەوەكەی تصدیق و پشتن ڕاستی كردەوە، ئەوە ئەو پەتە قایمەیە كەپچڕانی بۆ نییە (العروة الوثقى) وە ئەوەشی بەزمان بیڵێت بەڵام بەدڵ نە یزانێن و بەكردەوەش پشتڕاستی نەكاتەوە ئەوە لێی قەبوڵ ناكرێت و لەئاخیرەتیش لەخەسارەت مەندانە.

سێیەم: ئیمامی سُفْیَانَ بْنَ عُیَیْنَةَ (ت١٩٨ه) دوای ئەوەی پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی مورجیئە، کە دەڵێن ئیمان وتەیە، وەهەروەها دەڵێ: ئێمە دەڵێین ئیمان وتەو کردەوەیە، وە دەڵێ مورجیئەکان ناویان لەتەرککردنی فەڕزەکان ناوە تاوان وەکو ئەو کەسەی تاوان دەکات، پاشان دەڵێ: (وَأَمَّا تَرْكُ الْفَرَائِضِ جُحُودًا فَهُوَ كُفْرٌ مِثْلُ كُفْرِ إِبْلِيسَ لَعَنَهُ اللَّهُ، وَتَرْكُهُمْ عَلَى مَعْرِفَةٍ مِنْ غَيْرِ جُحُودٍ فَهُوَ كُفْرٌ مِثْلُ كُفْرِ عُلَمَاءِ الْيَهُودِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ) (كتاب السنة لعبد الله بن أحمد(١/٣٤)). واتا: تەرککردنی فەڕزەکان و نکوڵی لێکردنی ئەوە کوفرە، وەکو کوفری ئیبلیس لەعنەتی اللَّه تعالی لێ بێت، وە تەرکردنیان بەزانینەوە بەبێ ئەوەی نکوڵی لێ بکەن ئەوە کوفرە وەکو کوفری زانایانی یەهوود اللَّه تعالی ش زاناترە. سەرنج بدە گوتی تەرککردنی پاش زانینیان و بەبێ ئەوەی نکوڵیش لێ بکەن کوفرە ! وەکو کوفری زانایانی یەهوود کە تەرکی حوکمیان کرد ! بۆیە اللَّەش بەکافری دانان، ئەوەی لەدەربارەی مورجیئەکان گوت، بۆیە ئەوانە ی ئیستحلال بەمەرج دەگرن لەتەرککردنی ئەمرەکانی اللَّه مورجیئەن!

چوارەم: الْحُمَيْدِيُّ ئیجماعي زانایاني سـەلەف لەسـەر کوفری پەك خسـتنی هەر حوکم و فەرزێك بە موتڵەقی, ئەگەرچی نکوڵیشی لێ نەکات جا ئیمام دەڵێ: (وَأُخْبِرْتُ أَنَّ قَوْمًا يَقُولُونَ: " إِنَّ مَنْ أَقَرَّ بِالصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ وَالصَّوْمِ وَالْحَجِّ وَلَمْ يَفْعَلْ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا حَتَّى يَمُوتَ أَوْ يُصَلِّيَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةَ حَتَّى يَمُوتَ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، مَا لَمْ يَكُنْ جَاحِدًا... فَقُلْتُ: هَذَا الْكُفْرُ بِاللَّهِ الصُّرَاحُ، وَخِلاَفُ كِتَابِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ ﷺ ، وَفِعْلِ الْمُسْلِمِينَ) (أخرجه الخلال في السنة (٥٨٦/٣)).
واتا: هەواڵم پێدراوە کەوا هەندێك کەس وتویانە: کەسـی وا هەیە ئیقرار ئەکات بە واجیبەتی نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج وە دانیان پێدا ئەنێت, بەڵام شـتێك لەمانە ئەنجام نادات هەتاوەکو دەمرێت , یاخود نوێژیش ئەکات بەڵام بە پێچەوانەوە هەر پشـت لە قیبلە ئەکات هەتاوەکو دەمرێت , ئەوا ئەو کەسـە ئیماندارە مادام جاحد نییە و نکوڵیان لێ ناکات، چونکە دان ئەنێت بە فەریزەکان و ڕوکردنە قیبلە؛ منیش گوتم: ئەوە کوفرێکی ڕوونە، وە خیلافی قورئان و سوننەتی رسول اللَّه ﷺ و کردەوەی موسوڵمانانە.
سەرنج بدە ئەی کەسێك تەواوی حوکمەکانی اللَّه تعالى پەك بخات ؟ دەبێ ئەوە حوکمی چی بێت ؟ لەکاتێك صیفەتێك لەصیفەتەکانی اللَّه تعالى پەك خستووە ئەویش (الحَكَم)ــە

پێنجەم: أحمد بن حنبل دەربارەی پیاوێك كە دان بەنوێژ دادەنێت و دانیش بەهەموو فەرزەكان دەنێت، بەڵام هیچ یەكێك لەوانە ناكات هەتا دەمرێت، ئەویش گوتی: (مَنْ قَالَ هذا فَقَدْ كَفَرَ بِاللّهِ وَرَدَّ عَلى اللّهِ أَمْرهُ ، وَعَلَى الرَّسُولِ مَا جاءَ بِهِ) (السنة : ٣/ ٥٨٦) . واتا: هەركەسێك ئەوە بڵێ ئەوە كوفری كردووە بە اللَّه تعالى و ڕەدی فەرمانەكانی اللَّه تعالى داوەتەوەو وە ئەوەشی رسول اللَّه ﷺ پێی هاتووە.

شەشەم: أبو ثور (٢٤٠هـ) دوای ئەوەی باسی ئەو پیاوە دەكات كە دەڵێ دان بەهەموو ئەوامیرو فەرمانەكانی اللَّه دەنێم بەڵام كاریان پێ ناكەم، جا أبو ثور دەڵێ: (لَا يَكُونُ مُؤْمِنًا إلَّا إذَا الْتَزَمَ بِالْعَمَلِ مَعَ الْإِقْرَارِ وَإِلَّا فَلَوْ أَقَرَّ وَلَمْ يَلْتَزِمْ الْعَمَلَ لَمْ يَكُنْ مُؤْمِنًا) (مجموع الفتاوى (٣٨٩/٧). واتا: ئیماندار نییە ئیلا گەر ئیلتیزامی هەبوو بەكردەوە پێكردنی لەگەڵ داننان، وە ئەگەر دانی پێدانا بەلام ئیلتیزامی پێوە نەبوو بەعەمەل و كردەوە پێكردنی، ئەوە ئیماندار نییە.
گوتم: ئەی ئەو كەسەی اللَّه فەهمی پێ بەخشیوی ئەوە وتەی سەلەف نییە ؟ كە كەسێك دان بە فەرمانەكانی اللَّه بنێت بەڵام كاریان پێ نەكات ئەوە ئیماندار نییە جا دوای ئەو بەڵگانە چۆن شەرم ناتگرێ و داوای لێ خۆشبوون لە اللَّه ناكەی !؟.

هەروەها ئیمامی الآجري (ت٣٦٠ه) دەربارەی ئەوانەی کردەوە ناکەن بەفەرمانەکانی الله دەڵێ: (فَمَنْ لَمْ يُصَدِّق الْإِيمَانَ بِعَمَلِه وَبِجَوَارِحِه: مِثْلُ الطَّهَارَة، وَالصَّلَاة وَالزَّكَاة، وَالصِّيَام وَالْحَجِّ وَالْجِهَاد، وَأَشْبَاهٌ لِهَذِه وَرَضِيَ مِنْ نَفْسِه بِالْمَعْرِفَة وَالْقَوْلِ لَمْ يَكُنْ مُؤْمِنًا، وَلَمْ يَنْفَعْهُ الْمَعْرِفَةُ وَالْقَوْلُ، وَكَانَ تَرْكُهُ لِلْعَمَلِ تَكْذِيبًا مِنْهُ لِإِيمَانِه، وَكَانَ الْعَمَلُ بِمَا ذَكَرْنَاهُ تَصْدِيقًا مِنْهُ لِإِيمَانِه) (الشريعة للآجري(٥١٤/٢) واتا: ئەوەی ئیمانەکەی پشت ڕاست نەکاتەوە بەکردار و ئەندامەکانی، پاك و خاوێنی و نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و جیهادو هاوشێوەی ئەو کردەوانە، جا کەسێك ڕازی بوو بەوەی وای زانی کەتەنها زانین ئیمان لەدڵەوەو گوتنی بەزمان بەسە بۆی ئەوە ئیماندار نییە، وە زانین لەدڵەوەو گوتنی بەزمان سوودی پێناگەیەنێ وە تەرککردنی کردەوەکان ئیمانەکەی بەدرۆ دەخاتەوە، چونکە کردەوە ئەوەی کەباسمان کرد بەڕاست دانانی ئیمانەکەیەتی.

حەوتەم: ابن بطة (ت٣٨٧ه دەڵێ: (وَلَا يَكُونُ الْعَبْدُ مُؤْمِنًا إِلَّا بِأَنْ يَجْمَعَهَا كُلَّهَا حَتَّى يَكُونَ مُؤْمِنًا بِقَلْبِه , مُقرًّا بِلِسَانِه , عَامِلاً مُجْتَهِدًا بِجَوَارِحه , ثُمَّ لَا يَكُونُ أَيْضًا مَع ذَلِكَ مُؤْمِنًا حَتَّى يَكُونَ مُوَافِقًا لِلسُّنَّة فِي كُلِّ مَا يَقُولُهُ وَيَعْمَلُه، مُتَّبِعًا لِلْكِتَابِ وَالْعِلْمِ فِي جَمِيعِ أَقْوَالِه وَأَعْمَالِه , وَبِكُلِّ مَا شَرَحْتُهُ لَكُمْ نَزَلَ بِه الْقُرْآنُ, وَمَضَتْ بِهِ السُّنَّةُ , وَأَجْمَعَ عَلَيْه عُلَمَاءُ الْأُمَّة) (الإبانة الكبرى(٧٦١/٢) واتا: بەندە نابێتە ئیماندار هەتاوەکو هەموان کۆنەکاتەوە، هەتا بەدڵ ئیماندار دەبێت، وەبەزمانی دانپێدان بکات، وە کردەوە بکات تێبکۆشێت بەئەندامەکانی لاشەی، وەلەگەڵ ئەوەش ئیماندار نابێت هەتا موافقی سوننەت نەبێت لەهەموو ئەو شتانەی کەدەیڵێت و ئەنجامی بدات، شوێنکەوتەی قورئان و زانست بێت لەهەموو گوتراوێك و کردارێکی، هەموو ئەوەی کەبۆم باسکردن قورئان لەسەر ئەوە دابەزیوە، وەسوننەتیش لەسەر ئەوە ڕۆیشتووە وە زانایانی ئوممەتیش لەسەر ئەوەکۆدەنگ بووینە.

هەشتەم: الآجري (ت٣٦٠ه) دەربارەی ئەوانەی کە کردەوەیان نییە بە فەرمانەکانی الله دەڵێ: (إِنَّ الْإِيمَانَ مَعْرِفَةٌ بِالْقَلْبِ تَصْدِيقًا يَقِينًا، وَقَوْلٌ بِاللِّسَانِ، وَعَمَلٌ بِالْجَوَارِحِ، وَلَا يَكُونُ مُؤْمِنًا إِلَّا بِهَذِهِ الثَّلَاثَة، لَا يُجْزِئُ بَعْضُهَا عَنْ بَعْضٍ) (الشريعة للآجري(٥٨٤/٢) واتا: ئیمان ناسینە بەدڵ وە بەڕاست دانانێك بە یەقینەوە، وە وتەیە بەزمان، وە کردەوەیە بەئەندامەکان، هیچ کەسێك ئیماندار نییە ئیلا بەو سێ شتە نەبێت، هەندێکی لەهەندێکیان جیا نابێتەوە.

نۆیەم: ابن بطة (ت٣٨٧ه) دەربارەی ئەو ئایەتانەی کەبەڵگەن لەسەر ئەوە ی کردەوە عەمەل لەئیمانەو ئەوانەی تەرکی شەریعەت و بەرنامەو ئەمرەکانی اللَّه دەکەن دەڵێ: (فَقَدْ تَلَوْتُ عَلَيْكُمْ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مَا يَدُلُّ الْعُقَلَاءَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّ الْإِيمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ , وَأَنَّ مَنْ صَدَّقَ بِالْقَوْلِ وَتَرَكَ الْعَمَلَ كَانَ مُكَذِّبًا وَخَارِجًا مِنَ الْإِيمَانِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ قَوْلًا إِلَّا بِعَمَلٍ , وَلَا عَمَلًا إِلَّا بِقَوْلٍ) (الإبانة الكبرى(٢/٧٩٢) واتا: لەکیتابەکەی اللَّه ئایەتم بۆ هێنانەوە کەبەڵگەن بۆ خاوەن عەقڵەکان لە ئیمانداران کە ئیمان وتەو کردارە، وە ئەوەشی بەزمان باوەڕی پێ هەبوو بەکردەوە تەرکی کرد ئەوە درۆزنەو لەدەرەوەی ئیمانە وە بەڕاستی اللَّه وتە بەبێ کردار قەبوڵ ناکات وە کردەوەش بەبێ وتە قەبوڵ ناکات.

دەیەم: بەلای تەواوی زانایانی سەلەفەوە هەرکەسێك یەك شت لە شەریعەتی الله تعالی بگۆڕێت و تەبدیل بکات ئەوا ئەو کەسە بێباوەرە, واتا : تەنها تەبدیل کردنی یەك شت لە شەریعەتەکەی الله تعالی کوفری گەورەیە بە ئیجماعی زانایان. هەروەکو چۆن ابن القطان دەفەرمووێ: (اتفقوا أنه مذ مات عليه السلام وانقطع الوحي، وكمل الدين [واستقر، و] لا يحل لأحد أن يزيد في الدين شيئًا من رأيه بغير استدلال منه، ولا أن ينقص منه شيئًا ولا أن يبدل شيئًا مكان شيء، ولا أن يحدث شريعة [وأن من فعل] ذلك كافر). (كتاب الإقناع في مسائل الإجماع لابن القطان (١/ ٤٨ _ ٤٩) واتا: گشتیان (واتا:

زانایانی ســەلەف ) ئیجماعیان هەیە و یەکدەنگــن کەوا هەر لەوکاتەوەی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە , وەحی نەماوە و پچڕاوە , وە دینیش کامل بووە و جێگــیر بووە , کە بۆ هیچ کەســێك حەڵاڵ نییە بە ڕاو بۆچوونی خۆی شــتێك لە دین زیاد بکات بەبێ ئیســتدلال کردن بە وەحیەوە یان هیچ شــتێکی لێ کەم بکاتەوە وە بە هیچ شــێوەیەك حەڵاڵ نییە کەوا هیچ شــتێك بخاتە جێگــای شــتێکی ترەوە و تەبدیلی بکات یان شــەریعەت و بەرنامەیەك دابهێنــێت هەرکەســێك شــتێك لەم کارانەی ئەنجامدا ئەوا ئەو کەســە کافرە.

جا جوان سەرنج بدە لێرەدا إبن القطان ئیجماعی نەقڵ کرد کەوا هەرکەس شــتێك لەمانە ئەنجام بدات ئەوا ئەو کەســە کافرە بەبێ خیلاف وە بە هیچ شــێوەیەك نەهات شــەرت و مەرج دابنێت لەســەر ئەوەی کە ئەگــەر بیداتە پاڵ الله یان غەیری بەرنامەی اللەی پێ باشــتر بێت ئینجا تەکفیری بکات , نەخێر بەڵکو هەر موجەڕەد تەبدیل کردنی شــەریعەتی بە کوفری گەورە ناوبرد و هیچ قەید و مەرجێکیشــی بۆ دانەنا، کەوایە قەید کردنی ئەم مەســەلەیە تەنها بە اعتقاد فکرەیەکی جەهمیانەیە کە ســەلەف یاخود ئەهلی ســوننە بە گــشــتی لێی بەریە.

یازدەیەم: ئیمامی حەسەنی بەصری دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ﴾ (المائدة:١٣). دەڵێ: (تَرَكُوا عُرَى دِينِهِمْ، وَوَظَائِفَ اللَّهِ جَلَّ ثَنَاؤُهُ الَّتِي لَا تُقْبَلُ الْأَعْمَالُ إِلَّا بِهَا) (أخرجه الطبري : ١١٥٨٨) واتا: تەركی پەت و گرێی دینەكەیان كردبوو, وە تەركی ئەو فەرز كراوانەی الله تعالى ـیان كردبوو كە هیچ یەكێ لە كردەوەكان قبول نابن ئیلا بەوانەوە نەبێت.

دوانزەیەم: ئیمامی قەتادە دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ (المائدة:١٤). دەڵێ: (إِنَّ الْقَوْمَ لَمَّا تَرَكُوا كِتَابَ اللَّهِ ، وَعَصَوْا رُسُلَهُ ، وَضَيَّعُوا فَرَائِضَهُ وَعَطَّلُوا حُدُودَهُ، أَلْقَى بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ بِأَعْمَالِهِمْ أَعْمَالَ السُّوءِ ، وَلَوْ أَخَذَ الْقَوْمُ كِتَابَ اللَّهِ وَأَمْرَهُ، مَا افْتَرَقُوا وَلَا تَبَاغَضُوا). (أخرجه الطبري ١١٦٠١) واتا: هەر قەومێك كاتێك تەركی كتابی الله تعالى ـیان كرد و وازیان لێی هێنا و سەرپێچی پێغەمبەرەكانیان كردبێت و فەرز كراوەكانیان فەوتاندبێت و حدودەكانیشیان تەعطیل كردبێت , ئەوا الله سبحانە وتعالى عەداوەت و ڕق و كینەی خستووەتە ناویانەوە هەتاوەكو ڕۆژی قیامەت , ئەویش بەهۆی ئەم كردەوە خراپانەیە كە ئەنجامیان داوە , خۆ ئەگەر قەومێكیش دەستیان گرتبێت بە كتێب و فەرمانەكانی الله ئەوا نە پەرتەوازە بووینە و نە ڕق و كینەش لەنێوانیاندا درووست بووە.

سێزدەیەم: ابن أبی زمنین دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ﴾ (المائدة:١٣). دەڵێ: (أَيْ: نَسُوا كِتَابَ اللَّهِ، وَضَيَّعُوا فَرَائِضَهُ، وَعَطَّلُوا حُدُودَهُ) (تفسير القرآن العزيز لابن أبي زمنين (١٦/٢) واتا: کتابی الله ـیان فەرامۆش کردبوو, وە فەرزکراوەکانیان ئەفەوتاند و حدودەکانیشـیان تەعطیل و پەکخستبوو. جا ئایە ئەم ئیمامە بەڕیزەش بەلای ئێوە خەواریجە ؟!

وە هەروەها ئەوە لەخەلەفیش هاتووە کە تەرکی ئەوامرەکانیان بەکوللی بەکوفر زانیوە، هەروەکو چۆن ابن تيمية لە مەجموع فەتاواکەی بۆمان نەقڵ دەکات و دەڵێ: (لَوْ قُدِّرَ أَنَّ قَوْمًا قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ نَحْنُ نُؤْمِنُ بِمَا جِئْتَنَا بِهِ بِقُلُوبِنَا مِنْ غَيْرِ شَكٍّ؛ وَنُقِرُّ بِأَلْسِنَتِنَا بِالشَّهَادَتَيْنِ إلَّا أَنَّا لَا نُطِيعُك فِي شَيْءٍ مِمَّا أَمَرْت بِهِ وَنَهَيْت عَنْهُ فَلَا نُصَلِّي وَلَا نَصُومُ وَلَا نَحُجُّ وَلَا نُصَدِّقُ الْحَدِيثَ وَلَا نُؤَدِّي الْأَمَانَةَ وَلَا نَفِي بِالْعَهْدِ وَلَا نَصِلُ الرَّحِمَ وَلَا نَفْعَلُ شَيْئًا مِنْ الْخَيْرِ الَّذِي أَمَرْت بِهِ وَنَشْرَبُ الْخَمْرَ؛ وَنَنْكِحُ ذَوَاتِ الْمَحَارِمِ بِالزِّنَا الظَّاهِرِ وَنَقْتُلُ مَنْ قَدَرْنَا عَلَيْهِ مِنْ أَصْحَابِك وَأُمَّتِك وَنَأْخُذُ أَمْوَالَهُمْ بَلْ نَقْتُلُك أَيْضًا وَنُقَاتِلُك مَعَ أَعْدَائِك؛ هَلْ كَانَ يَتَوَهَّمُ عَاقِلٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ لَهُمْ: أَنْتُمْ مُؤْمِنُونَ كَامِلُو الْإِيمَانِ وَأَنْتُمْ مِنْ أَهْلِ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيُرْجَى لَكُمْ أَلَّا يَدْخُلَ أَحَدٌ مِنْكُمْ النَّارَ بَلْ كُلُّ مُسْلِمٍ يَعْلَمُ بِالِاضْطِرَارِ أَنَّهُ يَقُولُ لَهُمْ: أَنْتُمْ أَكْفَرُ النَّاسِ بِمَا جِئْت بِهِ وَيَضْرِبُ رِقَابَهُمْ إنْ لَمْ يَتُوبُوا مِنْ ذَلِكَ). (مجموع الفتاوى ((٢٨٧/٧)) واتا: ئەگەر وادامنا قەومێك بە رسول اللّە ﷺ یان گوت: ئێمە ئیمان بەوە دێنین کە بۆت هێناوین

بەدڵمان بەبێ هیچ شکێك، وە بەزمانمان ئیقرار بەدوو شەهادەکە دەکەین، ئیلا ئەوە نەبێ ئێمە گوێڕایەڵیت ناکەین لەهیچ شتێك لەاوانەی فەرمانت پێ کردووەو لەوانەشی کە نەهیت لێ کردووە، نە نوێژ دەکەین و نەحەج دەکەین و وە پشتراستی هیچ وتەیەك ناکەینەوە، ئەمانەت ناگێڕینەوە، بەوەفا نابین بەرامبەر بە پەیمان، سەردانی بەجێ ناهێنین، هیچ شتێکی خێر ناکەین کە فەرمانت پێکردووە، مەشروب دەخۆینەوە، زەواج لەگەڵ مەحرەم دەکەین بەزینا، وە هەرکێ لە صەحابەکانت دەستمان پێی بگات دەیکوژین و ئوممەتەکەت دەکوژین و ماڵ و سامانیان دەبەین، بەڵکو تۆش دەکوژین، وە جەنگت دژ دەکەین لەگەڵ دوژمنەکانت، ئایە هیچ عاقڵێك وا گومان دەبات کە رسول اللَّه ﷺ پێیان دەڵێ: ئێوە ئیماندارى کامل ئیمانن، وە ئێوە ئەهلی شەفاعەتی منن لەڕۆژی دوایی، وە ڕەجا وایە هیچ یەکێك لەئێوە نەچێتە ئاگرەوە، بەڵکو هەموو موسوڵمانێك بەزەڕورەتەوە ئەوە دەزانێ کە رسول اللَّه ﷺ پێیان دەڵێ: ئێوە کافرترینی خەڵکین بەوەی کە پێی هاتووم، وە کوشتاریان دەکات ئەگەر تەوبە لەوە نەکەن. سەرنج بدە لەگەڵ ئەوەی کە دانیان بەهەموو شتەکان نا بەڵام تەرکی کوللیان کرد بۆیە بێباوەڕ بوون وە بەوەش نا ئەوە شتێکە لەدین بەزەڕورەت زانراوە کە دەبێ هەموو کەسێك ئەوانەی پێ موسوڵمان نەبێ بۆیە ئەوە کوفری پشت لێ هەڵکردنە وەك کوفرەکەی فیرعەون و ئیبلیس هەروەك چۆن ابن تیمیة لە وتەیەکی تری دەڵێ:

(فمن لم يَنْقَدْ لأمره فهو إمَّا مُكَذِّبٌ له أو مُمْتَنِعٌ عن الانقياد لربه، وكلاهما كفرٌ صريحٌ) (الصارم المسلول على شاتم الرسول (ص: ٥٢١) واتا: هەر کەسێک فەرمانداری فەرمانی اللَّه تعالی نەبێت ئەوە یان ئەوەتا ئیمانی پێی نییە یان خۆی ڕێگری دەکات لە ملکەچ بوون بۆ پەروەردگاری (ئیمانی پێیەتی بەڵام تەرکی ملکەچبوون وکردەوە وواجبەکان دەکات) هەردووکیان کوفرێکی ڕوون وئاشکران.

هەروەها ابن القيم دەڵێ: (وَأَمَّا كُفْرُ الْإِبَاءِ وَالِاسْتِكْبَارِ فَنَحْوُ كُفْرِ إِبْلِيسَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَجْحَدْ أَمْرَ اللَّهِ وَلَا قَابَلَهُ بِالْإِنْكَارِ، وَإِنَّمَا تَلَقَّاهُ بِالْإِبَاءِ وَالِاسْتِكْبَارِ، وَمِنْ هَذَا كُفْرُ مَنْ عَرَفَ صِدْقَ الرَّسُولِ، وَأَنَّهُ جَاءَ بِالْحَقِّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ، وَلَمْ يَنْقَدْ لَهُ إِبَاءً وَاسْتِكْبَارًا، وَهُوَ الْغَالِبُ عَلَى كُفْرِ أَعْدَاءِ الرُّسُلِ) (مدارج السالكين (١/ ٣٤٦) واتا: بەڵام کوفری گوێنەدان و خۆبەگەورە زانین، وەکو کوفرەکەی ئیبلیس، ئەو نکوڵی لەئەمری اللَّه ـی نەکرد وە ئینکاریشی نەکرد، بەڵام کوفرەکەی گوێنەدان و خۆبەگەورە زانین بوو، وە لەم کوفرەش ئەوەی باوەڕی بە ڕاستی رسول هەبوو کە بە حەقەوە لەلایەن اللەوە هاتووە بەڵام گوێڕایەڵی نابێت وەکو گوێنەدانێک و خۆبەگەورەزانینێک، وە ئەم کوفرەش بەربڵاو بووە لە ناو کوفری دوژمنەکانی پێغەمبەران .

جا سەرنج بدە ابن القیم انقیاد و گوێڕایەڵ نەبوونی بە ئەمرەکانی اللَّه بەبێ جەحدیش (نکوڵی) بە کوفر ناوبرد، واتە ئەوەی باوەڕی بە حەق و ڕاستی و دروستی ئەمرەکانی اللَّه  هەبێت و جەحدیان نەکات، بەڵام ئامادە نەبێت گوێڕایەڵیان بکات بەهەمان ئەو جۆرەی کە شەیطان گوێڕایەڵی ئەمرێکی اللَّه ی نەکرد ئەوە بێباوەڕ دەبێتەوە بە اللَّه.

## وەڵامی شوبهەیەکی تر:

ئایا ئیمامی موعاویەی کوڕی أبو سوفیان تەشریعی کرد یان حکم بغیر ما أنزل اللَّەی کرد کاتێك گوتی : موسڵمان میرات لە کافر (ئەهلی کتاب) ئەبات؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: شوبهەکەیان ئەوەیە دەڵێن : رسول اللَّه ﷺ فەرموویەتی: (لَا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلَا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ) (أخرجه البخاري (٦٧٦٤). واتا: موسڵمان میرات لە کافر نابات وە کافریش میرات لە موسڵمان نابات.

وە کەسێك هاتە لای موعاویە پێی گوت : باوکم لە نەصارِایە و براکانیشم بەهەمان شێوە جا بۆیە موسڵمان نابم چونکە دەترسم میراتم لەو باوکەم دەست نەکەوێت، موعاویەش فەرمووی: ئێمە میرات لەوان دەبەین هەروەکو چۆن ژنیان لێ دەخوازین ، بەڵام ئەوان میرات لە ئێمە نابەن هەروەکو چۆن ژنمان لێ ناخوازن.

بۆیە دەڵێن : مادام موعاویە حوکمێکی رسول اللّٰه ﷺ ـی گۆڕی و حکم بغير ما أنزل اللّٰهـی کرد و تەشریعی کرد بەڵام بۆچی پێی کافر نەبوویەوە؟؟؟

دەڵێن: مادام وایە حکم بغير ما أنزل اللّٰه بە هیچ جۆرێك نابێتە کوفری گەورە!

## لە وەڵامی ئەم شوبهەیە ئەڵێین :

یەکەم: دوو شتمان هەیە لە دینی ئیسلامدا:

یەکەمیان: چەند شتانێکن کە موحکەمن و ئیجتیهاد هەڵناگرن و چەسپاون بەبەڵگەی ئایەت و حەدیث و إجماعی سەلەف، بۆ نموونە: حەڕامیەتی زینا، وە حەڕامیەتی مەشڕوب، کەس ناتوانێت ئیجتیهاد لەم بابەتە چەسپاوانەدا بکات.

دووەم: چەند شتانێکن کە موتەشابیهن و ئیجتیهاد هەڵدەگرن ، لابەلا ڕاجیایی لەسەر هەیە، سەرەڕای ئەوەی کۆدەنگیشی لەسەر بوو ئەوا لەسەر خاوەن ئیجتیهادەکە ناکەوێت ، بۆ نموونە شکانی دەستنوێژ لە خێزان یان لە ئافرەتی بێگانە، یان چەند بابەتێکی تری فیقهی کە ئیجتیهاد هەڵدەگرن ، ئەگەر حەدیسی صەحیحیشی لەسەر بێت ئەوا تەئویلاتی هەڵە لەم بابەتانەدا نابێتە تاوان بگرە ئەجریشی تێدایە.

جا بابەتی میرات لە جۆری دووەمە و ڕا جیاوازی تێیدا نابێتە حکم بغير ما أنزل اللّٰه، وە ئیمامی موعاویەش بە هیچ جۆرێك حكم بغير ما أنزل اللّٰهـی نەکرد لێرەدا کاتێك کە وتی: ئێمە میرات لەوان دەبەین هەروەکو چۆن ژنیان لێ مارە دەکەین (لە ئەهلی کتاب) ، بەڵام ئەوان میرات لە ئێمە نابەن...

دووەم : وەکو وتمان : میرات بردن لە کافران ڕا جیاوازی لەسەرە و بابەتێکی موتەشابیهە و ئیجتیهاد هەڵدەگرێت، وە پێش موعاویەش چەندین صەحابەی تری بەڕێز وتویانە : موسڵمان میرات لە باوکێکی کافر دەبات ، کەواتە هەر حاکمێك لەم نێوەندەدا هەر ڕایەکی هەبێت و هەڵەشی تێدا بکات ڕاستە نەیپێکاوە بەڵام حكم بغير ما أنزل اللّٰهی نەکردووە؛ وە دوو ڕا لەسەر ئەم بابەتە هەیە :

یەکەم: بەشی هەرە زۆری سەلەف دەڵێن : نە موسڵمان میرات لە کافر دەبات، نە کافریش لە موسڵمان میرات دەبات .

دووەم: بەشێکی کەمی سەلەف دەڵێن: موسڵمان میرات لە کافری غیر محارب دەبات بەڵام لە محاربی نابات وە کافر میرات لە موسڵمان نابات ، لەوانە: معاذی کوڕی جبل محمد کوڕی ئیمامی علی سەعیدی کوڕی المسیب مەسروقی کوڕی الأجدع عبداللّٰه بن مغفلویحیی بن یعمر، وإسحاق بن راهویە (أحكام أهل الذمة" (٢/ ٨٥٣).

کە هەندێکیان پێش موعاویەش ژیاون، وە ابن تیمیەش دەڵێ: میراتیان لێدەگرین و ئەوان میراتمان لێ ناگرن.

کەواتە با شوبهەچیەکان چەواشەکاری نەکەن و بڵێن: موعاویە لەخۆیەوە شتی داهێناو حكم بغير ما أنزل اللّٰهی کردو کەچی کافریش نەبوو پێی ، جا

شوبهەچیەکان هەمیشە حەزیان لە شت گەورە کردنە، وە زیادەڕۆیی لە بابەتەکاندا دەکەن و چەواشەی تێدا دەکەن بە سوودی خۆیان، پێش موعاویەش ئەو صەحابە بەڕێزانە گوتویانە : موسڵمان میرات لە باوکی غیر محاربی کافر دەبات ، بۆیە ئەوان درۆ دەکەن کە دەڵێن: موعاویە شتی داهێناو تەشریعیشی کرد و پێشی کافر نەبوویەوە ، موعاویە پشتی بە ڕای ئەو صەحابە بەڕێزانەی تر بەست نەوەك بەخۆی تەشریع بکات ، وە گریمان ئەو صەحابانەی پێش موعاویەش بیانگوتبا موسڵمان میرات لە کافر نابات، وە موعاویەش بهاتایە و بیگوتایە بەڵێ دەیبات ، هێشتا بەو جۆرەش هەر ئیجتیهادێکی کردووە و نەیپێکاوە نەوەك حكم بغير ما أنزل اللّهــ کردبێت.

سێیەم: سەرەڕای هەموو ئەمانە ، گریمان موعاویە حكم بغير ما أنزل اللّهــ کرد لەم بابەتەدا  بە قسەی شوبهەچیەکان  ئایا جورئەتی ئەوە دەکەن بڵێن : موعاویە بەهۆی ئەم کارەیەوە کوفری بچووکی کردووە ؟؟!! ئەم کارە لە صەحابییەك دەوەشێتەوە کە کوفری بچوك بکات ؟ ئەمە ئەوپەڕی بێ ڕێزیە بە صەحابە جا ئەگەر بڵێن: حكم بغير ما أنزل اللّهــ تێدا کردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارەکەشی کوفری بچوك نەبووە ، ئەوە هەر بەمە خۆیان بە درۆ دەخەنەوە !! چونکە شەڕی ئەوان لەگەڵ ئێمەدا لەسەر ئەوەیە کە حكم بغير ما أنزل اللّه کوفری بچووکە .

کەواتە دوو ڕێگایان لە پێشە: یان ئەوەتا ئەبێت بڵێن: موعاویە لەم کارەیدا کوفری بچووکی کردووە، چونکە ئەویش وەکو ئێمە مرۆڤە و مەعصوم نییە و بەڕائەتی بۆ نەهاتووە لە هەڵە هەتاوەکو بڵێن: نەخێر بۆ موعاویە بە هیچ شێوەیەك کوفر نییە؛ یانیش ئەوەتا ئەبێت بڵێن: ئەم کارەی موعاویە هیچ پەیوەندی بە حكم بغير ما أنزل اللَّه و تەشریعەوە نییە.

## لەچ حاڵەتێك حوكم كردن بەغەیری قورئان كفر دون كفره كوفری بچوكه

زانایان باسیان كردووه لەچ كاتێك حوكم نەكردن بەقورئان كوفری بچوكه لەوانه:

ابن تیمیة دەربارەی حوكم كردن به قورئان و ئەو حاكمەی كه حوكم بەقورئان ناكات دەڵێ: (فَإِنَّ الْحَاكِمَ إذَا كَانَ دَيِّنًا لَكِنَّهُ حَكَمَ بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَإِنْ كَانَ عَالِمًا لَكِنَّهُ حَكَمَ بِخِلَافِ الْحَقِّ الَّذِي يَعْلَمُهُ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَإِذَا حَكَمَ بِلَا عَدْلٍ وَلَا عِلْمٍ كَانَ أَوْلَى أَنْ يَكُونَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ) (مجموع الفتاوى ٣٨٨/٣٥) واتا: ئەگەر حاكم دیندار بوو بەڵام حوكمی بەغەیری ئەوەكرد كه اللّه تعالی داییەزاندووه، ئەوا له ئەهلی ئاگره وه ئەگەر زانابوو حوكمی كرد بەپێچەوانەی ئەو هەقەی كەدەیزانێت ئەوا ئەهلی ئاگره وه ئەگەر حوكمی كرد بەبێ علم و بەبێ عەدل ئەوه ئەولاتره به ئاگر.

پاشان دەڵێ: (وَهَذَا إذَا حَكَمَ فِي قَضِيَّةٍ مُعَيَّنَةٍ لِشَخْصٍ). واتا: ئەوه ئەگەر دادەوەری كرد لەقەزیەكی دیاری كراودا بۆكەسێک. جوان سەرنج بده وتەكەی ابن تیمیة ئەو حاكمەی كه تەركی حوكمی كردووه له قەزیەكی دیاری كراو نەك تەواوی شەریعەتی تەرك كردبێ، هەروەكو چۆن گوتی: (وَهَذَا إذَا حَكَمَ فِي قَضِيَّةٍ مُعَيَّنَةٍ لِشَخْصٍ).كەواته بۆی نییه تەركی حوكم

بکات لەقەزیەکی دیاری کراویش چجای ئەوەی هەموو شەریعەت پەك بخات و تەرکی بکات !

هەروەها ابن تیمیة دەڵێ: (أَمَّا مَنْ كَانَ مُلْتَزِمًا لِحُكْمِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ بَاطِنًا وَظَاهِرًا، لَكِنْ عَصَى وَاتَّبَعَ هَوَاهُ، فَهَذَا بِمَنْزِلَةِ أَمْثَالِهِ مِنَ الْعُصَاةِ). (منهاج السنة ٥/ ١٣١) واتا: بەڵام ئەوکەسەی پابەندە بەحوکمی اللَّه تعالى و رسول اللَّه ﷺ لەناخەوەوە لەڕوکەشیشدا بەڵام سەرپێچی لەحوکمەکە ئەکات شوێن ئارەزوی خۆی ئەکەوێت ئەوا لەهاوشێوەی تاوانبارانە.

ابن القيم دەربارەی حوکم کردن بەغەیری ئەوەی اللَّه دایبەزاندووە لە قەزیەکی دیاری کراودا دەڵێ: (إِنِ اعْتَقَدَ وُجُوبَ الْحُكْمِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِي هَذِهِ الْوَاقِعَةِ، وَعَدَلَ عَنْهُ عِصْيَانًا، مَعَ اعْتِرَافِهِ بِأَنَّهُ مُسْتَحِقٌّ لِلْعُقُوبَةِ، فَهَذَا كُفْرٌ أَصْغَرُ) (مدارج السالكين ١/ ٣٣٦). واتا: جا ئەگەر حاکمەکە بیروباوەڕی وابوو کە حوکم کرد بەقورئان واجبە لەو ڕووداوە (واتا: لەقەزیەکی دیاری کراو) بە لام لەوحوکمە بەمەعصیەتەوە لایدا، لەگەڵ داننان بەوەی کە شایستەی سزایە، ئەوە کوفری بچووکە.

شێخ محمد ابن ابراهیم دەڵێ: (وأما الذي قيل فيه كفر دون كفر إذا حاكم إلى غير اللَّه مع اعتقاده أنه عاص وأن حكم اللَّه هو الحق فهذا الذي يصدر منه المرة ونحوها أما الذي جعل قوانين بترتيب وتخضيع فهو كفر وإن قالوا أخطأنا وحكم الشرع أعدل فهو كفر ناقل عن الملة). فتاوى محمد بن إبراهيم ١٢/٢٨٠) واتا:
ئەوەی پێی ئەوترێ کوفری بچوك ئەگەر حوکمی کرد بەبێ حوکم کردن بەشەرعی اللَّه وەبیروباوەڕی وابوو کەتاوانی کردووە وەحوکم بەشەرعی اللَّه حەق ترو ڕاسترە وەئەم کردەوە ئەگەر لەتەمەنیدا یەکجار ئەنجامی دا، بەڵام ئەگەر کوفری کرد بەقانون بەتەرتیب بەیاسا وە خەڵکی پێ مل کەچ کرد ئەوە کوفری کردوە وەئەگەر وتیشی هەڵە بووم ورحوکمی شەرع عەدل دادپەروەرانەو ڕاسترە هەرچەند واش بڵێ کوفری گەورەی کردووە لەئیسلام دەرچوە.
ئەوەش وەڵامێکی تێدایە بۆ ئەوانەی دەڵێن ئەو گاڵتە جارِیە چییە گەر جارێك و دوان ئەوی لێ ڕوو بدات ! ئەی ئەوە ئێوە نین ئیستدلال بەوتەی ابن القيم دەکنە لەو شتانەی کەوا موافقی بۆچوونی خۆتانە ؟!

ابن أبي العز لەكاتی شەرحی وتەی هیچ كەسێك كافر ناكەین بەهۆی تاوانەوە دەڵێ: (وهنا أمر يجب أن يُتفطَّن له، وهو أن الحكم بغير ما أنزل الله قد يكون كفرًا ينقل عن المِلَّة، وقد يكون معصيةً كبيرةً أو صغيرةً، ويكون كفرًا: إما مجازيًّا، وإما كفرًا أصغر، على القولين المذكورين، وذلك بحسب حال الحكم: فإنه إن اعتقد أنَّ الحكم بما أنزل الله غير واجب، وأنه مخيَّرٌ فيه، أو استهان به، مع تيقنه أنه حكم الله؛ فهذا كفرٌ أكبر، وإن اعتقد وجوب الحكم بما أنزل الله ، وعلمه في هذه الواقعة ، وعدل عنه، مع اعترافه بأنه مستحقٌّ للعقوبة؛ فهذا عاصٍ ، ويسمى كافرًا كفرًا مجازيًّا أو كفرًا أصغر)). (شرح العقيدة الطحاوية: ص (٣٢٣). واتە: لێرەدا شتێك هەیە كە پێویستە ئاگاداری بین ئەویش حوكم كردن بەجگە لەوەی اللَّه دایبەزاندووە، لەوانەیە كوفرێك بێت پێی لە ئیسلام بچێتەدەر وە لەوانەشە تاوانێكی گەورە بێت، وە دەبێتە كوفریش: یان كوفری گەورە یان كوفری بچووك، جا گەر بڕوای وابووە كە حوكمی اللَّه واجب نییە یاخود هەڵبژاردەیە لەوەی حوكمی پێنەكات، یاخود ئیهانەی پێ كرد لەگەڵ ئەوەش بڕوای بەوە هەبوو كە حوكمی اللَّه یە، ئەوا كوفری گەورەیە، بەڵام ئەگەر بڕوای بەواجبێتی حوكمی اللَّه هەبوو لەو قەزیەیەدا، وە دانبنێت بەوەی شایستەی سزایە، ئەوەیان تاوانبارە وە پێی دەگوترێت كافرێكی كوفری گەورە یان كوفری بچووك. سەرنج بدە گوتی: في هذه الواقعة لەو قەزیەیەدا !

**بەکورتی ئەوەی باسمان کرد لەپێشوودا کە حوکم نەکرد بە قورئان کوفری بچووکە بەچەند ضوابط و مەرجێك:**

**یەکەم:** ئەگەر حوکمەکە چەندجارێك بوو، یان لە ڕووداوێك بەدیاری کراوی، یان لەقەزیەکی دیاردا، ئەوە ئەهلی عیلم ڕوونیان کردەوە لەوانە: ابن القيم، وە ابن أبي العز، وە شێخ محمد بن إبراهيم.

**دووەم:** مولتەزیم بێت بەحوکمی اللَّه و رسولەکەی لەناخەوەو لە ڕووکەشدا، بەڵام حوکمێکیدا بەهۆی هەواو ئارەزووەوە، ئەوەش وتەی ابن تیمیةیە.

**سێیەم:** ئیعتیراف بەتاوانەکەی بکات و بیروباوەڕی وابێت کە حوکمی اللَّه واجبە لەو ڕووداوە دیاری کراوەدا، ئەوەش وتەی: ابن القيم، وە ابن أبي العز، وە شێخ محمد بن إبراهيم.

## شوبهەیەك و وەڵام دانەوە:

بەشێك لەوانەی دەربارەی ئەو بابەتەیان نوسیوە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو حاکمەی حوکم بەغەیری قورئان دەکات بێباوەڕ نییە ئیلا ئەگەر نکوڵی لەحوکمی اللَّه بکات حوکم کردن بەغەیری قورئانی پێ حەڵاڵ بێت.

## ئەو شوبهەیە ڕەتکراوەیە بەسەر خاوەنەکەی لەبەر چەند هۆکار:

١. بەستنەوەی بە نکوڵی و ئیستحلال لە تەکفیری ئەو حاکمەی بەغەیری قورئان حوکم دەکات، بەو شێوە حەصرەی هیچ یەکێك لەئەهلی عیلم وای نەگوتوە وە ئیجماعی صەحابە هەیە کە خودی تاوانی موکەففیرە بکەرەکەی پێی بێباوەڕ دەبێت بەتەنها کردنی، بەبێ ئەوەی سەیر بکرێت ئایە نکوڵی کردووە یاخودیش بەحەڵاڵی زانیوە لەوانە: نوێژ نەکەر، حوکمکردن بەغەیری ئەوەی اللَّه دایبەزاندووە، وە جوێندان بە اللَّه و رسول اللَّه ﷺ.

٢. ئەوانەی دەڵێن کە تەنها بە ئیستحلال و بەنکوڵی کردن لەدین دەچێتە دەرەوە ئەوە توشی شوبهەی مورجیئەکان بوون کە کە ئیستحلال و نکوڵیان بەمەرج دەگرت بۆ ئەو کەسەی کردار یاخود وتەی کوفری دەکات، ئەوەش مەرجێکی فاسدە چونکە کەسێك وابڵێ ئەوە وای نیشان نەداوە کە ئیمان وتەیە بەزمان و ئیعتیقادی دڵەو کردەوەیە بەلاشە، ئەوەی هەڵوەشاندۆتەوە پەنا بە اللَّه تعالى.

٣. حەصرکردنی کوفر لەمەسەلەیەکدا بەیەك شێواز، کە بریتییە لە ئیستحلال و نکوڵی (جحود) جا ئەهلی عیلم شێوەی تریان لەو بابەتە باسکردووە نەك تەنها جحود و ئیستحلال.

وەڵام و ڕەتدانەوەی ئەو گومانانە لەلایەن: (اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء)

لێژنەی هەمیشەی بۆ گەڕانی زانستی و فەتوا دان وەڵامی ئەو شوبهەیە ئیرجائە دەداتەوە بەتایبەت کتێبەکەی: خالد العنبري کە بەناو نیشانی الحكم بغير ما أنزل اللّٰه وأصول التكفير. کە زۆرێك لەمورجیئەکانی ئەو سەردەمە سوودیان لەو ژەهرە وەرگرتووە

جا لێژنە دەڵێ: الحمد لله وحده والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه، وبعد فقد اطلعت اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء على كتاب بعنوان (الحكم بغير ما أنزل اللّٰه وأصول التكفير) لكاتبه خالد على العنبري، وبعد دراسة الكتاب اتضح أنه يحتوي على إخلال بالأمانة العلمية فيما نقله عن علماء أهل السنة والجماعة، وتحريف للأدلة عن دلالتها التي تقتضيها اللغة العربية ومقاصد الشريعة. ومن ذلك ما يلي:
١. تحريفه لمعاني الأدلة الشرعية، والتصرف في بعض النصوص المنقولة عن أهل العلم، حذفاً أو تغييراً على وجه يُفهم منها غير المراد أصلاً.
واتا: گۆڕینی مانای بەڵگە شەرعیەکان و دەستکاری کردنی لەهەندێك ئەو نصوصە وتراوانەی ئەهلی عیلم، بەڕەشکردنەوە یان گۆڕینی بەو شێوازەی کە لێی تێدەگەی کە مەبەستە ئەصڵەکەی نییە.

**٢. تفسير بعض مقالات أهل العلم بما لا يوافق مقاصدهم.**

تەفسیرکردنی بەشێك لەوتەکانی ئەهلی عیلم کە موافقی مەبەستی وتەکانیان نییە.

**٣. الكذب على أهل العلم، وذلك في نسبته للعلامة محمد بن إبراهيم آل شيخ - رحمه الله - ما لم يقله.**

واتا: درۆکردن بەناوی ئەهلی عیلم، بەوەش قسە دانە پاڵ محمد بن ابراهيم آل شيخ کە نەیگوتووە.

**٤. دعواه إجماع أهل السنة على عدم كفر من حكم بغير ما أنزل اللَّه في التشريع العام إلا بالإستحلال القلبي كسائر المعاصي التي دون الكفر.**

واتا: بانگەشەکردنی ئیجماع ئەهلی سوننە لەسەر کافر نەبوونی ئەو کەسەی حوکم بەغەیری قورئان دەکات لەتەشریع و داهێنانی گشتی، ئیلا بە ئیستحلالی دڵ وەکو هەموو ئەو تاوانانەی کە لەخوار کوفرن.

**٥. وهذا محض إفتراء على أهل السنة، منشؤه الجهل أو سوء القصد نسأل الله السلامة والعافية.**

واتا: ئەوە بوهتان هەڵبەستنە بۆسەر ئەهلی سوننە، کەسەرچاوەکەی جەهل و نەزانینە، یانیش ویستی خراپە، داوای سەلامەتی لە اللَّه تعالیدەکەین.

**٦.** وبناء على ما تقدم، فإن اللجنة ترى تحريم طبع الكتاب المذكور ونشره وبيعه، وتُذَكر الكاتب بالتوبة إلى اللَّه تعالى ومراجعة أهل العلم الموثوقين ليتعلم منهم ويبينوا له زلاته.

واتا:وەدەربارەی ئەوەی کەباسکرا، لێژنە وای دەبینێ کە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی و فرۆشتنی ئەو کتێبەی کەباسکرا حەرامە، وە نوسەرکەی بەوە ئامۆژگاری دەکرێت کە تەوبە بکات بۆ لای اللَّه تعالی وە موراجەعە ی ئەهلی عیلمی سیقە پێکراو بکات بۆ ئەوەی لێیانەوە فێربێ و هەڵەکانی بۆ بەیان بکەن.

جا ئەوەی جێگای داخە کەسانێك هاتوون ڕیك ئەو کتێبەیان کردووە بەکوردی و وتەکانیان وەکو خۆی نەقڵ کردووە بوونە بەهۆکاری گومڕابوونی خەڵکانێکی زۆر، داوای سەلامەتی لە اللَّه تعالی دەکەین.

وە لەکۆتاییدا داوا لە اللَّه تعالی دەکەین ڕاگیراومان بکات لەسەر حەق و هیدایەتی ڕێی ڕاستمان بدات، وە سەبارەت بە نوسینی ئەو کتێبە لەپاش قورئانی پیرۆز پشتم بەچەندین کتێبی سەلەف و خەلەف بەستووە، وە سوودم ڕاو پێشنیاری کەسانێکی دڵسۆزیش وەرگرتووە. داواکارم لە اللە تعالی پاداشتی ئەوانیش بداتەوە.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.

